


نەبی یڵدز

# خەیاڵەکانت

## ئامانەتی خودایە

ئارام بگرە! چونکە ئارامگرتن لە ڕۆژە سەختەکاندا
کلیلی ڕۆژە خۆشەکانە



وەرگێڕانی:
شانیا حدال

## دەنگی ناخت

سڵاو...

من دەنگی ناخی تۆم ... دەی وەرە، با کەمێک پێکەوە دەردەدڵ بکەین. بەڵام زۆر جوان گوێم بۆ بگرە، باشە؟ چونکە ئەو شتانەی ئێستا لە منی دەبیستیت لەوانەیە بە درێژایی تەمەنت جارێکی دیکە لە کەسی دیکەی نەبیستیتەوە. دەزانم زۆر بە خراپی غەمبارکراویت. دەزانم ئەو کەسانەی کە خۆشتویستن، گرنگیت پێدان و دڵخۆشتکردن هیچیان شایەنی ئەوە نەبوون و تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆیان لە لاتبوون، وە پەیوەستی تۆیان بە عەشق و خۆشەویستی و چاکەوە بە خراپی بەکارهێنا. دەزانم زۆر بە ئازاربووی کاتێک ڕووی ڕاستی ژێر ماسکە درۆینەکانت زانی. دەزانم هەموو ئەو شتانەی بە ڕاستت دەزانین وەک چەقۆ ناخی تۆیان بڕی. دەزانم لە قوڵایی ناختەوە بە بێدەنگی ناڵەو هاوارتە و دەڵێیت؛ "من شایەنی ئەمانە نەبووم"!

دەزانم کەسانی چواردەورت ئازار و ڕوخانت فەرامۆشدەکەن و لێتدەپرسن کە بۆچی کەسێکی بەم جۆرەت خۆشویستووە؟ دەپرسن کە بۆچی کەسایەتییەکی خراپ دەرچوو؟ دەزانم هێندە قسەت زۆرە بیکەیت و بێدەنگ دەمێنیتەوە، چونکە کەس نییە

لێتێبگات. بەڵام تۆش ئەوە بزانە گەر ژیان یاسای ئازاربەخشی هەبێت، خودا دەرگای زۆری هەیە کە بۆ هەمیشە بە ڕوومانداکراوەن. گەر کەسانێک هەبن ئازارت بدەن، کەسانێکیش هەن کە دەیانەوێت دڵت خۆشبکەن. ئەوەی کە بە بارگرانی زۆر تاقیتدەکاتەوە، زۆر لەوە زیاترت پێدەبەخشێت کە شایەنێت. ئەوەی کە ڕووبەڕووی کەسانی خراپتدەکاتەوە، لە کۆتاییدا بە کەسانی باش و نیەت پاکیشت دەناسێنێت.

لە یادی مەکە، لە هیچ پەرتووکێکی پیرۆزدا و لە هیچ چیرۆکێکدا باس لەوە نەکراوە کە چاکە و باشی کەسێک بە هەدەر چووبێت. باس لەوەش نەکراوە کە کەسێک کەسانی دیکەی ئازاردابێت و خراپەی بەرامبەر کردبن یاخود دڵی شکاندبن ژیانێکی ئاسوودە و خۆشی بەسەر بردبێت. باشەکان بۆ باشەکان و خراپەکان بۆ خراپەکان دەبن! بێگومان هەموو کەسێک لە کۆتاییدا سزا و پاداشتی خۆی وەردەگرێت.

نەکەیت خەمباربیت!

تۆ خودایەکت هەیە کە گوێبیستتە، وە خاوەن دادپەروەریی ڕاستەقینەیە. هیچ خەم مەخۆ!

ڕۆژێک سەرزەنشتی هەموویان دەکەیت و مافی گریان و دلشکانەکانت وەردەگریتەوە. ئارامبگرە ...

## سەرلە نوێ دەستپێبکەرەوە...

ئەوەی پێیدا تێپەڕیویت چەند خراپ بووە با خراپ بێت، کێ چەند بە خراپی مامەڵەت لەگەڵ دەکات با بیکات، ئەوە لە یاد مەکە ئەم دونیایە خۆشی و جوانیشی تێدایە بۆ کەسە باشەکان.

نەکەی بێئومێد بیت، ئەگەر الله کەسانێکی بەدیهێنابێت کە دڵ دەشکێنن گومانت نەبێت کەسانێکیشی بەدیهێناوە کە چاکی بکەنەوە. تۆ پەنا بە خودا بگرە، هێز تەنها لای ئەوە و دەتوانێت هەموو ئەو ناخۆشییانەی بەسەرت هاتووە کۆبکاتەوە و لە بەرامبەریدا دیارییەکی زۆر جوانت پێببەخشێت. لەوانەیە ئەمە کۆتا تاقیکردنەوەی ناخۆشت بێت، بۆیە هەوڵبدە تێیدا سەرکەوتووبیت.

شایەنی ئەوە نەبوویت کە تێیدا ژیایت؟

کەوایە ئێستا کاتی ئەوەیە ئەوە بژیت کە شایەنتە...

زیاد لە پێویست خەمبار بوویت؟

ئامادەبە، ئێستا نۆرەی دڵخۆشبوونتە ...

تۆ تەنها ئامادەبە بۆ دڵخۆشبوون، پشت بە خودا ببەستە، ئارامبگرە و سەرلەنوێ دەستپێبکەرەوە...

”ڕەشبین مەبە، لە دۆڕان مەترسە. سەد جاریش بڕوخێیت لە جاری سەدویەکەمدا دەستپێبکەرەوە. باوەڕ و ئومێدەکانت بپارێزە. لەیادی مەکە بێگومان ڕۆژێک سەردەکەویت!“

## تۆ پێویستت بە خۆتە...

کەس بچووک مەکەرەوە و کەسیش زیاد لە پێویست گەورە مەکە لە چاوتدا. هەرگیز واز لە باشبوون مەهێنە. تۆش چاکە بەرامبەر ئەو کەسانە بکە کە چاکن بەرامبەرت. کێ خراپەت بەرامبەر دەکات با بیکات، تۆ خراپە بەرامبەر بە هیچ کەسێک مەکە. بەڵام هەرگیز ئەو خراپانەش لەیاد مەکە کە بەرامبەرت کراوە.

ڕێگا بە کەس مەدە بچووکت بکاتەوە. هەوڵبدە خۆت لەگەڵ دەردەکانت بجەنگیت. بە هاوکاری کەس نەگەشتوویت بەم ڕۆژانە، بەبێ کەسیش نامریت، لە یادی مەکە...

خۆت بۆ هیچ شتێکی بچووک خەمبار مەکە، خۆت وێران مەکە بە خەمخواردن بۆ ئەو شتانەی ڕوودەدەن، یاخود ڕوونادەن. نوقمی ڕەشبینی مەبە و لەوە زیاتر خۆت لەناو مەبە...

ئەوە بزانە کە پێویستت بە چەقۆی کەس نییە، خۆت دەتوانیت ورگی خۆت ببڕیت. بزانە کە پێویستت بە ئەستێرەی هیچ کەسێک

نییە، خۆت دەتوانیت پلە و پایەی خۆت دیاری بکەیت. لە یادی مەکە، هەرچیت بەسەردێت با بێت، دەبێت لەسەر پێی خۆت بوەستیت. تۆ چەندین کێشەت تێپەڕاندووە. بێگومان ئەمانەش تێدەپەڕێنیت.

**"دەردەکانت خۆشبوێت، ئیکرامی خودایە، نەکەیت تەنانەت 'ئۆف'یش بڵێیت، بزانە ئەمە تاقیکردنەوەیە".**

## شایەنی ئەوەیە بۆی خەمباربیت؟

گەر ڕۆشتبێت ڕۆشتووە! بۆچی خۆت خەمبار دەکەیت؟ لە کاتێکدا دەبێت فرمێسک بۆ ئەو کەسانە بڕژێت کە شایەنین، بۆچی فرمێسک بۆ ئەوانە دەڕژێت کە شایەنی نین؟

بڵێ، ئەو کەسەی کردتە تاجی سەرت، هەر بە ڕاستی شایەنی ئەوە بوو؟ کاتێک تۆ تەنانەت شەرمت لەوەش دەکرد قسەی لەگەڵ بکەیت ئەو هیچ بیریکردەوە تۆ چیت بەسەردێت؟ چەندین شەو نەنووستیت، چەندین شەوت بەو جۆرە بەسەربرد، چی گۆڕا؟ هەموو خۆشەویستییەکەی کۆبکەیتەوە بە فرمێسکێکی چاوی تۆ دەبێت؟ ئێستا پێمبڵێ بزانم، بە ڕاستی شایەنی ئەوەیە خەمی بۆ بخۆیت؟

خۆت هەڵمەخەڵەتێنە، کەمێک ڕاستییەکان ببینە! گەر بیرتیبکردایە دەهات، گەر خەمی تۆیبووایە پەیوەندی دەکرد، گەر خۆشیبویستیتایە خۆی دەکرد بە خاوەنت. ئیتر قبووڵی بکە، ئەو ڕۆیشت، چیدی ناگەڕێتەوە ...

کاتی ئەوە نەهاتووە خۆت لەو خەیاڵانە ڕزگار بکەیت و پلانی ڕاستەقینە بۆ داهاتووی خۆت دابنێیت؟ چاوەڕوانی چیت بۆ دەستپێکێکی نوێ؟

لە یادی مەکە، دڵخۆشبوونت لە دەستی خۆتدایە. تەنها ئەوە بەسە کە لەگەڵ کەسێکی ڕاستدا، لە کاتێکی ڕاستدا، وەک یەکەم ڕۆژ سەر لە نوێ دەستپێبکەیتەوە...

**"گەر کەسێک بە ڕاستی تۆی خۆشبوێت بەرگەی بینینی خەمباری تۆ ناگرێت، تۆ خۆتبە، خۆت بۆ کەسانێک خەمبار مەکە کە گرنگی بە خەمباری تۆ نادەن. "**

## بە نیوەیی بەجێمایت؟

خۆشتویست! شەو و ڕۆژ و هەموو شتێکیت خۆشویست. خۆت کردە خاوەنی ئەو، وەک ئەوەی پارچەیەک بوو بێت لە تۆ. کردتە هاوبەشی خۆشەویستیت، دڵت، هەستەکانت، کردتە هاوبەشی هەموو شتێکت ...

ئەویش تەنها هیچێک بوو! بەبێ هیچ هاتە نێو ژیانتەوە، هیچ شتێکی بۆت نەکرد، هیچ شتێکی پێنەبەخشیت. تەنها هەست و خۆشەویستی تۆی بەکارهێنا. خۆشینەویستیت، بۆ ئەوە هاتبوو کە بڕوات. کە بەرژەوەندییەکانی کۆتایی هات ڕۆیشت، وەک ئەوەی هیچ شتێک نەبووبێت. کاتێک ڕۆیشت زۆر شتی تۆشی لەگەڵ خۆی برد. تۆی بە نیوەناچڵی بەجێهێشت..

بەڵام هەرچەند زیانی بە تۆ گەیاندبێت و کەموکورت بووبێت تۆ هەرگیز ڕەشبین مەبە. لە قەدەرت زویر مەبە و لە داهاتووت هەڵبێیت. بە تاوانبارکردنی خۆت و زویر بوون لە کەسانی دیکە برینەکانت قوڵتر مەکەرەوە! هەرچەند خراپە ببینیت واز لە چاکە

مەهێنە. لە یادی مەکە دونیا هێشتا بە هۆی کەسە باشەکانەوە ماوە...

بەجێیان هێشتیت تا بمریت؟ خەم مەخۆ! بێگومان ڕۆژێک سەرلەنوێ لە دایک دەبیتەوە. بە نیوەیی بەجێمایت؟ خەم مەخۆ! بێگومان ڕۆژێک نیوەکەی دیکەت دەدۆزیتەوە. تەنها ئارامبگرە! ڕۆژێک تۆش زۆر دڵخۆش دەبیت ...

**"گەر عەشق تەواوکاریی بێت، ئەوە تەنها بە یەکگرتنی دوو نیوە تەواو دەبێت. هەرچەند بە نیوەیی بەجێمابیت گومانت لەوە نەبێت ڕۆژێک نیوەیەکی دیکە تەواوت دەکات. ئارامبگرە..."**

## پێویستە بژیت!

## وازمەهێنە...

پێویستە بژیت بۆ ئەوەی ببینیت الله چۆن سزای ئەو کەسانە دەدات کە ئەمانەیان بەسەرهێنایت. پێویستە بژیت بۆ ئەوەی نیشانی ئەو کەسانەی بدەیت بێچارە نیت کە دەیانویست بە بێچارەیی بتبینن. بۆ ئەوەی بیسەلمێنیت باوەڕت بەو قسەیە هەیە کە خودای گەورە دەفەرموێت؛ "مافی ئەو کەسە لە لای منە کە مافی خوراوە"، پێویستە بژیت.

گەر باوەڕیشت بە دڵخۆشی نەبێت دەبێت بژیت هەتاکو خەمباری ئەو کەسانە ببینیت کە تۆیان نوقمی خەم و ئازار کرد. پێویستە بژیت هەتا شێوەیان ببینیت کە چۆن ڕەنگ دەگۆڕن کاتێک دێن و پێت دەڵێن؛ "بمبورە!"

پێویستە بژیت هەتا ببینیت چۆن خەڵکی لێیان زویر دەبێت ئەو کەسانەی تۆ و خەڵکی دیکەیان زویر دەکرد و ئازاریان دەدان. دەبێت بژیت هەتا ببینیت چۆن ئەم نووسینانەم دەبنە ڕاستی بەپێی

تێپەڕبوونی کات. ئێستا لەوانەیە وا بیربکەیتەوە بەڵێنی بێمانات پێدەدەم و دەمەوێت واتلێبکەم واز لە هەندێک شت بهێنیت و بڕوام پێنەکەیت، بەڵام هەتا ئێستا بڕوات بە هەموو کەس کردووە، بۆ جارێکیش بێت بڕوا بە من بکە. خۆ چی لە دەست دەدەیت؟

**ئەو کەسانە لەدەست مەدە کە خۆشیاندەوێیت**
**بۆ کەسێک کە خۆشیناوێیت**

## ئازاردەچێژیت...

ئەوەت قبوڵکردووە کە لەلایەن کەسێکی درۆزنەوە پەیوەستی تۆ بۆ عەشق بە خراپە بەکارهێندراوە، ناتوانیت لە خۆت ببوریت لەبەر ئەوەی متمانەت بە کەسێکی هەڵە کرد و خۆشتویست. ئیدی خەڵکی بە زیادە دەزانیت. بەم جۆرەش لە هەموو کەس و لە هەموو شتێک خۆت بەدوور دەگریت. چونکە وا بیردەکەیتەوە هیچ کەسێک لە تۆ تێناگات. هەست بە تەنیایی و بێچارەیی دەکەیت. بەڵام بە هەڵەداچوویت...

سەیرێکی چواردەورت بکە؛ لە ڕاستیدا هیچ تەنیا نیت. کەسانێک هەن کە تۆیان خۆشدەوێت و نایانەوێت خەمباربیت، بۆیە هەوڵ بۆ دڵخۆشکردنت دەدەن. بەڵێ، لەوانەیە ئازار بچێژیت. هەموو ئەو کەسانەی تۆیان خۆشدەوێت دەزانن شایەنی ئەو ئازار چەشتنە نیت، بەڵام تەنها خۆت درکت پێنەکردووە. هەتا کەی ڕووت لەم کەسانە وەردەگێڕیت کە لە هەموو بارودۆخێکدا هەوڵ دەدەن هاوکاریت بکەن؟ لە یادی مەکە، لە لای زۆر کەس بە نرخیت. وە دەبێت هەتا زووە بێیتەوە سەرخۆت.

دەی هەستەوە! خۆت کۆبکەوە و بڕیار بدە؛

بۆ کەسێک کە تۆی خۆشناوێت هەموو ئەم کەسانە لە دەست دەدەیت کە خۆشیاندەوێیت؟

”لـەبـەر عـەشـق دۆسـتـە
خۆشەویستەکانت لەدەست
مەدە، چونکە جودایی هێندە
قورسە گەر دۆستێکت نەبێت
شانت بداتێ ناتوانیت لەژێر
باری دەربچییت“

## بەبێ بوونی ئەویش دەتوانیت بەردەوام بیت...

بڕوانە، لە خۆڕا خۆت خەمبار و ڕەشبین مەکە. ئەگەر ئەو تۆی بەجێهێشتبێت و توانیبێتی دڵخۆشبێت بەبێ تۆ، تۆش دەتوانیت بەبێ بوونی ئەو دڵخۆشبیت. گەر ئەو توانیبێتی تۆ لە نیوەی ڕێگەدا بەجێبهێڵێت تۆش دەتوانیت بە بێ بوونی ئەو بەردەوامی بە ڕێگاکەت بدەیت.

گەر ئەو توانیبێتی تۆ لە ژیانی دوربخاتەوە، تۆش دەتوانیت بەبێ بوونی ئەو بژیت. پێویستت بە پشتگیری هیچ کەسێک نییە، دەتوانیت بە تەنیا لەسەر پێی خۆت بوەستیت.

خۆت بچووک مەکەرەوە!

ئەو خەیاڵەکانتی ڕووخاندبێت دەتوانیت بە تەنیا خەیاڵی دیکە بکەیت. ئەو دەستتی بەردابێت، دەتوانیت خۆت دەستی خۆت بگریت. ئەو گرنگیت پێنەدات دەتوانیت کەسانێک بدۆزیتەوە گرنگیت پێبدەن. پێویست ناکات واز لە ژیانی خۆت بهێنیت بۆ ئەو کەسانەی وازیان لێهێنایت، بەبێ بوونی ئەوانیش دەتوانیت زۆر بە جوانی بژیت.

تەنها خۆت زیاد لە پێویست خەمبار مەکە، خۆت بچوک مەکەرەوە، وە واز لە باوەڕەکانت مەهێنە. چونکە دەتوانیت هەموو ئەمانە بەبێ بوونی ئەویش بکەیت.

”لە یادت نەچێت، ئەوانەی
دەیانەوێت بەکارتبهێنن، سەرەتا
متمانەی خودیت لەناو دەبەن. تۆ
خۆتبە، ڕێگە مەدە هیچ کەسێک
متمانە بەخۆبوونت لەناو ببات“

## ڕۆژێک ئەوانەش دەگرین کە خەڵکی دەگریەنن...

گەر لە کەسێک ڕانابینیت ببیتە هەڵگری گوناهەکانی، ئەوە هەوڵیش مەدە بیکەیتە هاوبەشی ژیانت. بەبێ ئەوەی کرۆکی دڵی کەسێک ببینیت بە ڕوخساری بڕیاری لەسەر مەدە.

بڕیار لەسەر ئەو شتانە مەدە کە نەتبینیون و نایانزانیت. تۆ خۆتبە، هەرگیز قسەی گەورە مەکە، چونکە ژیان بەو شتانە تاقیت دەکاتەوە کە ڕەخنەت لێگرتوون و ڕۆژێک دێت دەبیتە ژێردەستەیان...

چۆن مامەڵە لەگەڵ کەسێک بکەیت، چۆن کاریگەری لەسەر جێبهێڵیت، ژیانیش بەو جۆرە مامەڵەت لەگەڵ دەکات، و کەسانێکت بۆ دەنێرێت هەمان کاریگەریت لەسەر دروست بکەن. ئەگەر ئازاری کەسانێک بدەیت کە خۆشیاندەوێیت و گرنگیت پێدەدەن، وە بە خراپە بەکاریان بهێنیت و دوعات لێبکەن؛ ڕۆژێک دێت کەسانێک هەمان شتت بەرامبەر دەکەنەوە. چونکە دادپەروەری ڕاستییە! مرۆڤ هەتاکو ئەوە نەچێژێت کە خەڵکی تێدا ژیاندوە، هەتا باجی تاوانەکانی نەدات نامرێت.

لەیادی مەکە، ژیان بەوە ناسراوە چی بهێنێت دەشیباتەوە. هەموو کەس ڕۆژێک لە قەفەسی دادپەروەریدا بەند دەبێت.

**"گەر لەو شتانە هەڵبێیت کە دەبێت تێیدا بژیت، مەحکومی ئەو شتانە دەبیت کە هەرگیز ناخوازیت تێیدا بژیت"**

## بۆچی دەدۆڕێین؟

دەدۆڕێین، چونکە نیەتمان پاکە و هەموو کەسیش بە نیەت پاک دەزانین. کاتێک کەسێک بە ڕووماندا پێدەکەنێت هەر زوو باوەڕی پێدەکەین. دەدۆڕێین، چونکە پێمان وایە هێندە ئەوانمان خۆشدەوێت ئەوانیش خۆشیاندەوێینەوە، وە هیچ لە سۆزی ئەوان ناپرسین، هەرچی بڵێن خێرا باوەڕیان پێدەکەین ...

دەدۆڕێین، چونکە بۆ کەسانی نیوەناچڵ تەمەنێک خەیاڵی تێر و تەسەل دەکەین. کاتێکیش خەیاڵەکانمان هەرەس دەهێنن لە ژێریاندا بەجێدەمێنین و لەناو دەچین. دەدۆڕێین، چونکە لەو ساتەی دەبێت گوێ بۆ ئەقڵمان ڕادێرین گوێ بۆ دڵمان ڕادەگرین. کاتێک هەزار هۆکارمان هەیە بۆ ڕۆیشتن لەبەر یەک هۆکار مانەوە هەڵدەبژێرین.

دەدۆڕێین، چونکە ناتوانین بە هیچ کەسێک بڵێین نەخێر و بە هانای هەموو کەسەوە دەچین، بەڵام کاتێک خۆمان کێشە و دەردمان دەبێت داوای هاوکاری لە کەس ناکەین.

دەدۆڕێین، چونکە دڵخۆشکردنمان لە دڵخۆشبوون پێباشترە. بەهۆی هەوڵمان بۆ دڵخۆشکردنی ئەو کەسانەی خۆشمان دەوێن هیچ بیر لە خۆشبەختی خۆمان ناکەینەوە.

دەدۆڕێین، چونکە خۆشەویستیمان سنووری نییە. هێندە گرنگی بەو کەسانە دەدەین کە خۆشمان دەوێن وا بیردەکەنەوە کە هەرگیز ناتوانین وازیان لێبهێنین، بۆیە دەگۆڕێن و بەو پێیە مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن.

**”دەدۆڕێین چونکە ناتوانین**
**واز لە باشبوون بهێنین“**

## نەکەیت ماندوببیت...

ژیان هاریکارتە، هەموو ئەوەت لەگەڵ بەشدەکات کە دەیزانێت. هەوڵ دەدات هەتا تۆ ڕاست و هەڵەکان لەیەک جودا بکەیتەوە. هەوڵ دەدات تۆ لە خەم و دڵخۆشی تێبگەیت. هەندێک جار دەبێتە بار و دێتە سەر شانت، هەندێک جاریش باری سەرشانت بۆ هەڵدەگرێت. هەندێک جار وەک مامۆستایەک ڕاستییەکانت فێردەکات و هەندێک جار وەک هاوڕێیەک نهێنیەکان پەنهان دەدات. بەڵام هێندە یاسای توندی هەیە لە کاتی هەڵەکردنت بەزەیی پێتدا نایەتەوە. گەر تەنها یەکجاریش دوابکەویت بۆ هەمیشە بە نەبوو هەژمارت دەکات.

ئەو بەم جۆرە بێبەزەییە. ئەگەر ناتەوێت لە ژیان دوابکەویت، ڕێگە مەدە لەو ڕێگایەی پێیدا تێدەپەڕیت بەربەستەکان بتخەن. بارت هەرچەندە قورسە با قورس بێت، برینەکەت چەند قوڵە با قوڵ بێت، ئازارت چەند زۆرە با زۆر بێت، هەرگیز واز لە هەوڵ و بەرەوپێشچوون مەهێنە. نەکەیت بووەستیت، مەڕوخێ و هەرگیز نەکەیت ماندووببیت. چونکە ژیان هێندە خێرا دەڕوات گەر دوابکەویت هەرگیز بە دڵخۆشی ناگەیت.

”که وازت له کەسە
بێسوودەکانی ژیانت هێنا و ڕزگارت
بوو لێیان، ئیدی هیچ هۆکارێکت
نامێنێت بۆ خەمباربوون“

## لە هەڵەکردن مەترسە!

هەموو شتێک وەک ئەوە نابێت کە تۆ دەتەوێت. هەندێک جار دەدۆڕێیت، هەندێک جار دەکەویت و سەرکەوتوونابیت. زۆر کات هەموو شتێک بەسەر یەکەوە ڕوودەدات، هەڵە دەکەیت، دەگریت و تەنانەت بێچارە دەبیت. لە کۆتاییدا تۆش مرۆڤیت، دەکرێت هەموو شتێکت بەسەربێت. دەکرێت ڕێگاکەت سەخت بێت، تاقیکردنەوەی قورس بکرێیت، دەکرێت سەرت لێ بشێوێت و هەڵبژاردەی نادروست بکەیت. ژیان بەم جۆرەیە، کاتێک دەتەوێت ڕێگاکەت ڕێک بکەیتەوە توشی نەهامەتی زۆر دەبیت.

هەر نەهامەتییەک ژیایت بژی، ڕێگە مەدە هیچ کامێکیان لە هەوڵدانت بخات، ڕێگە مەدە ببنە هۆی وازهێنانت لە باوەڕەکەت. هەرچی ڕوودەدات با ڕووبدات لە هەڵەکردن و شکستخواردن مەترسە. هەرگیز نەکەیت لەوە بترسیت خەڵکی چۆن بیرت لێ دەکەنەوە، و ڕێگا مەدە کاریگەری نەرێنیت لەسەر دروست بکەن. مەهێڵە هەڵەکانت بترۆخێنن. گەر شکستیشت خوارد واز لە چاککردنەوەی هەڵەکانت مەهێنە. ئەگەر دڵت پاکبێت گومانت نەبێت ڕۆژێک خودا دەتخاتە سەر ڕێگای ڕاست. خەمت نەبێت ...

## سەرت نەوی مەکە تۆ تاوانبار نیت!

سەرت نەوی مەکە تۆ تاوانبار نیت. تۆ نە کەست کوشتووە، نە کەست هەڵخەڵەتاندووە و نە ژیانی کەست وێرانکردووە... تەنها نەتتوانی لە قسەی دڵت دەربچیت و دەتویست دڵت خۆشبێت. کەسێکت خۆشویست کە شایەنی نەبوو. ڕاستییەکەی ئەوەی تۆ کردت بە هەموو کەسێک دەکرێت. باوەڕتکرد و متمانەت کرد. تەنانەت نەشتدەزانی کە ئەوان نیازیان خراپە. واتدەزانی وەک خۆتن ...

لەجیاتی ئەوەی خۆت تاوانبار بکەیت و زیاتر ئازاری خۆت بدەیت، دەتوانیت ئەم پرسیارانە لە خۆت بکەیت و زوتر بە ڕاستییەکان بگەیت؛

-دووبارە دەگەڕێیتەوە لای؟

-دووبارە عاشق دەبیتەوە؟

-دووبارە بەم جۆرە خۆشتدەویست؟

نایکەیتەوە وانییە؟ عاشق نابیتەوە و ناگەڕێیتەوە لای. گەر وایە بە خۆڕایی مەگری. بە خۆڕایی خۆت تاوانبار مەکە و خۆت لە ژیان سارد مەکەرەوە. پێویست ناکات ژیانی خۆت بۆ

کەسانێک وێران بکەیت کە تۆیان بە لاوە گرنگ نییە. پێویست ناکات لە خەڵکی دیکە تورەببیت و سزای خۆت و ئەوانیش بدەیت. ئەگەر تاوانبارێک هەبێت ئەوە تۆ نیت. تۆ تەنها خۆشت ویست و متمانەت کرد. ئەوە بزانە خەڵەتان و بەکارهێنانی تۆ تاوانی تۆ نییە. وە تۆ بێبەریت لە هەموو ئەوانە.

"لـە هـەڵـەکـردن مـەتـرسـە، چونکە ئەو کـەسانەی کـە هەڵە دەکەن و لە هەڵەکانیان فێردەبن زۆر لـەو کـەسانە بـە ئـەزمـوونـتر و سـەرکـەوتـووتـرن کـە هـەڵـەیان نەکردووە."

## هەرچی ڕوودەدات با ڕووبدات

هەرچی ڕوودەدات با ڕووبدات واز لە سێ شت مەهێنە؛
گەر خراپەشت بەرامبەر بکەن واز لە باشبوون مەهێنە.
گەر هەموو شتێکیشت لەدەست بدەیت واز لە الله مەهێنە.
لە دوای هەر شتێک کە تەواو دەبێت واز لە سەرلەنوێ دەستپێکردنەوە مەهێنە.

هەرچی ڕوودەدات با ڕووبدات ئەم سێ شتە لە یاد مەکە؛
بە دڵنیاییەوە ئەم ڕۆژانە تێدەپەڕێت.
الله هەمیشە کام شتە خێری تێدایە ئەوەت بۆ هەڵدەبژێرێت.
ئەوانەی خراپەت بەرامبەر دەکەن بێگومان سزا وەردەگرن.

هەرچی ڕوودەدات با ڕووبدات ئەم سێ هەڵەیە مەکە؛
وا بیر مەکەرەوە چەند کەسێکت خۆشویست هێندە خۆشیان بوێیتەوە.
چاوەڕوانی هەڵوێستی جیاواز لە هەمان کەس مەکە.
بە ئاسانی باوەڕ بە هیچ کەسێک مەکە.

هەرچی ڕوودەدات با ڕووبدات واز لەم سێ شتە مەهێنە؛
واز لەو کەسانە مەهێنە کە لە کاتە سەختەکانتدا لەگەڵت بوون.
واز لەو کەسانە مەهێنە کە دڵنیایت خۆشیاندەوێیت.
واز لە نزاکانی شەوانت مەهێنە .

**”لە یادی مەکە، هەڵەکانت بە ئاسانی فریوت دەدەن، بەڵام بێگومان ڕۆژێک خیانەتت لێدەکەن و لە نیوەی ڕێگادا بەجێت دەهێڵن. هەرچی بڕواهێنانیشە بە ڕاستییەکان سەختە، بەڵام ڕۆژێک بێگومان دەتگەیەنێت بە کۆتایی ڕێگاکەت، ڕاستییەکان تێکەڵ مەکە“**

## بێئومێدمەبە!

دەکرێت خەمبار و ڕووخاوبیت، یاخود خەیاڵەکانت لەناوچووبن.

دەکرێت کەسێک ئومێدی پێدابێت و ئەو خۆشەویستی و گرنگییەی تۆ پێتبەخشیوە بە خراپە بەکاری هێنابێت. لەوانەیە خیانەتت لێکرابێت و هەڵخەڵەتێنرابیت، یاخود بەجێهێڵدرابیت لە نیوەی ڕێگاکەتدا...

خەمبار مەبە! هەموو کەس وەک ئەو بەرژەوەندیخواز نییە و لە نیوەی ڕێگادا بەجێت ناهێڵێت. کەسانێکیش هەن بە درێژایی تەمەنیان چاوەڕێت دەکەن. لەوانەیە تۆش لە نزای کەسێکدا بیت. کاتێک نزات کرد و گوتت؛ "خودایە چی خێری تێدایە ئەوەم بە نسیب بکە". ئەو کەسانە دێنە ڕێگات. بەڵکو ئەم ئێوارەیە قەدەر کەسێکی دڵپاک دێنێتە ڕێت. دڵنیابە ڕۆژێک تۆش ئەو دڵخۆشییە دەبینیت. خەمبار مەبە!

کە کاتی هات دێتە بەرامبەرت ئەویش، ئەو کەسەی کە تۆی تەنها لەبەر خۆت خۆشدەوێت... ئەویش دێت..

دڵنیابە کەسێکیش نزا بۆ تۆ دەکات و چاوەڕوانتە ...

**"ئارامبگرە! چونکە الله هەمیشە جوانترین پلانی هەیە بۆمان"**

## سەرلەنوێ باوەڕکردن دەستپێکێکی نوێیە...

لەوانەیە ڕۆژانی سەخت بەسەربەریت، لەوانەیە ژیانت لەلایەن کەسانێکەوە سەراوژێر کرابێت کە خۆشتدەویستن. لەوانەیە عەشقەکەت و خێزانەکەت، یاخود لە شوێنی کارەکەت پاڵەپەستۆی زۆرت بخەنە سەر. تەنانەت لەوانەیە ئەوەی تۆی تێدا دەژیت هێندە سەخت بێت هەموو کەس بەرگەی نەگرێت. بەڵام دەبێت سەرەڕای هەموو سەختییەکان بەردەوام بیت و کۆڵ نەدەیت. نابێت زیاد لە پێویست بیر بکەیتەوە و خۆت خەمبار بکەیت. نابێت بە خۆڕایی خۆت بێئومێد و ڕەشبین بکەیت. گەر ڕابردووت خراپ تێپەڕیبێت بەو واتایە نایەت کە داهاتوشت خراپ تێدەپەڕێت. گەر ژیان ڕووە ناشرین و خراپەکەی نیشانت دابێت ڕۆژێک دێت ڕووە باش و جوانەکەشیت نیشان دەدات. ئەم دەورانە دەسوڕێت و نۆرەی تۆش دێت. تۆش سەرت دەسوڕمێت. دەبینیت، تۆش زۆر دڵخۆش دەبیت.

ئەوە لە یاد مەکە، گەر دەتەوێت هەرچی زووە ژیانت بگۆڕێت دەبێت خۆت لەم ڕەشبینییە ڕزگار بکەیت و باوەڕ بەوە بهێنیت

کە هەموو شتێک باش دەبێت. چونکە سەر لە نوێ باوەڕکردن دەبێتەوە دەستپێکێکی نوێ بۆ تۆ، وە دەکرێت هەموو شتێک لە ڕەگ و ڕیشەوە بگۆڕێت.

**"واز لە باوەڕکردن مەهێنە! چونکە باوەڕکردن واتە دەستپێکردنەوە و دەستپێکردنەوەش واتە سەرکەوتن"**

## شەش ڕێگای بەدەستهێنانی دڵی ژنان

گەر دەتانەوێت دڵی ژنێک بەدەستبهێنن، دەبێت ئەم شەش خاڵە پەیڕەو بکەن؛

### بەدەستهێنانی متمانە...

پیاوێک هەرچەند قۆز و شیک و دەوڵەمەندبێت، گەر متمانەی ژنێکی بەدەستنەهێنا ئەوا هەرگیز ئەو ژنە عاشقی نابێت. بەنرخترین دیاری بتوانیت پێشکەشی ژنێکی بکەیت ئەوەیە متمانەی پێببەخشیت. گەر بتوانن متمانەی ژنێک بەدەستبهێنن واتا نیوەی ڕێگای بەدەستهێنانی ئەوتان بڕیوە.

### بەسەر نەفسدا زاڵبوون...

ژنەکان تەنها پارچە گۆشت و خوێن نین! دڵ و هەست و ترسیان هەیە. گەر پیاوێک بە چاوی نەفس سەیری ژنێک بکات وادەکات ئەو ژنە هەست بە بێنرخی بکات، وە هیچ ژنێک پیاوێکی خۆشناوێت کە وایلێبکات هەست بە بێنرخی بکات. گەر دەتەوێت ببیتە خاوەن دڵی ژنێک دەبێت بەسەر نەفستدا زاڵبیت.

## سۆزو ویژدان...

ژنان پیاوێکیان دەوێت لە ژیانیاندا هێندە بەسۆز بێت نەتوانێت ئەو خەمبار بکات، دەخوازێت هێندە بە ویـژدان بێت کاتێک هەڵەیەکی کرد پەشیمان ببێتەوە و داوای لێبوردن بکات.

لە یادی مەکە، ئەگەر دڵی ژنان دەرگای هەبێت ئەو دەرگایەش کلیلی هەیە، وە ئەو کلیلەش سۆز و میهرەبانییە. گەر پیاوێک سۆز و ویژدانی نەبێت هەرگیز ناتوانێت لەو دەرگایەوە بچێتە ژوورەوە.

## خاوەندارێتی...

ژنەکان پیاوەکان بەپێی ئەوە هەڵدەسەنگێنن کە چەند خۆشیاندەوێن و خاوەنداریان دەکەن. ژنێک هەرچەند بەهێزیش بێت ترس لە ناخیدا هەر هەیە و دەخوازێت لە لایەن ئەو پیاوەی خۆشی دەوێت پارێزگاری لێبکرێت. گەر پیاوێک بتوانێت لە هەموو دۆخ و ئیستێکدا لە بەرامبەر هەموو کەسێک ژنێک بپارێزێت و پشتگیری لێبکات، ئەوە هەتا کۆتایی تەمەنی خاوەنی ئەو ژنەیە.

## ڕاستگۆیی...

ماڵی ژنێک دڵی ئەو پیاوەیە کە خۆشی دەوێت. دەخوازێت هەست بە پەیوەستی بکات بە دڵنیییەوە. ژنەکان هەرگیز بەرگەی ئەوە ناگرن ئەو دڵەی ئەوان وەک چاویان دەیپارێزن لە لایەن کەسی دیکەوە پیس بکرێت. بۆیە ژنان بەبێ ڕاستگۆیی ناژین.

## دروستی...

ژنەکان لە هەموو شتێک زیاتر ڕقیان لە درۆیە. گەر ژنێک لە لایەن پیاوێکەوە درۆی لەگەڵ بکرێت بۆ هەمیشە وا هەستدەکات بۆ هەمیشە دەیخەڵەتێنن و درۆی لەگەڵ دەکەن. گەر ژنێک هەست بکات درۆی لەگەڵ دەکرێت هەست بە بێنرخی دەکات و هەرگیز دڵی ناداتە دەست ئەو پیاوە.

**لە یادی مەکەن؛ ئەو پیاوەی پەیڕەوی ئەم شەش خاڵە بکات دەبێتە پیاوێک هەموو ژنانی دونیا سەرسامی ببن.**

## لەلای ئەوکەسانە مەبە کە لەلات نین

## عەشق ڕێگە نەدانە بە لەدەستدانی خۆشەویستەکەت...

مرۆڤ ناتوانێت بە ئاسانی خۆشەویستەکەی لەدەست بدات. ناتوانێت پشتی لێبکات و بڕوات وەک ئەوەی هیچ شتێک ڕووی نەدابێت. عەشق گیانی مرۆڤە، وە هیچ کەسێک ناتوانێت واز لە گیانی خۆی بهێنێت. گەر کەسێک لە لای ئاسایی بێت تۆ لەدەست بدات، لەبەر هۆکاری بچووک بتوانێت وازت لێ بهێنێت وە هەمیشە هەڕەشەی بەجێهێشتنت لێبکات، ئەوە ئاشکرایە ئەو لە مێژە بەجێی هێشتوویت.

دەزانم سەختە، هەرچەند خۆشیشتبوێت ئەو کە ڕۆیشت هەرگیز ناگەڕێتەوە. هەرچەند هەوڵ بدەیت هەوڵبدە، هەوڵەکانت بێجگە لە خەمبارکردنی تۆ هیچ سوودێکی دیکەیان نابێت، وە هەرچی دەکەیت بیکە، هیچ شتێک ناتوانێت دڵخۆشت بکات. تۆ خۆتبە و ڕێگە مەدە هیچ کەسێک هەڕەشەی ڕۆشتنت لێبکات.

گەر کەسێک ویستی بڕوات بشمریت مـەڕۆڕەوە سەر ڕێگای
.گەر بێتۆیی هەڵبژاردبێت هەرگیز ئاوڕی بۆ مەدەرەوە. گەر ئەو
لەدەستدانی تۆی بەلاوە ئاسایی بێت تۆش هەرگیز لە لەدەستدانی
مەترسە.

لە یادی مەکە هیچ کەسێک شایەنی ئەوە نییە وازی لێنەهێنیت.
هەر کەسێک بڕوات بێگومان کەسێکی دیکەی هەڵبژاردووە بۆ
جێی تۆ. ژیان هەر شتێکت لێوەربگرێتەوە بە شێوەیەکی دیکەوە
دەیهێنێتەوە سەر ڕێت. تۆ تەنها بزانە کەی وازبهێنیت و کەی
ئارام بگریت.

## ناخت ئاسوودە بێت...

ئێستا تۆ پێتوایە کە ئەو هەموو شتێکی بەرامبەر کردوویت بە ئاسانی لەژێر باری دەردەچێت؟ لە خۆڕا ئازاری دایت، تۆی گریاند، هەڵی خەڵەتاندیت، بەکاریهێنایت، وادەزانیت سەرەڕای هەموو ئەمانە تا کۆتایی تەمەنی بە خۆشی دەژی؟ وا بیر دەکەیتەوە هەموو ئەو ڕۆژە ناخۆشانەت بە زیادە دەچن و هیچ لێپرسینەوەیەکی لێناکرێت؟ بەهەڵەدا دەچیت!

پەلە مەکە! وا مەزانە خودا ئەوانەی لە یاد کردوە کە بەرامبەرت کراوە. ئەو شەوانەی تا بەیانی دەگریایت، ئەو باجەی بەهۆی متمانە و خۆشەویستییەوە داوتە، هەموو ئەو پیلانانەی لە دژت دانراوە ... خودا هیچیانی لەیاد نەکردووە.. ناخت ئاسوودە بێت، دادوەری خودا ڕاستەقینەیە، بەڵام هەندێک کات هەتا کاتێکی دیاریکراو دوای دەخات. تاقیمان دەکاتەوە هەتا دەربکەوێت باشەکان ئارەزووی خراپبوون دەکەن؟ یان خراپەکان دەگۆڕێن بۆ باش؟ وە بەم جۆرە تاقیکردنەوە کە کۆتایی دێت، خودا فەرمان دەدات و شەڕ و خێر

دەگۆڕێن. بەهۆی هەر خراپەیەک کە بەرامبەر بە تۆ کردوویەتی ڕۆژێکی خۆش لە ژیانی دەسڕدرێتەوە. بۆ هەر دڵۆپێک فرمێسک کە ڕشتووتە خۆشییەک دێتە ڕێت و ناخۆشییەکیش بۆ سەر ڕێی ئەو. کاتێک تۆ دڵخۆش دەبیت ئەو نوقمی ئازار دەبێت.

لە یادی مەکە، هیچ کەسێک خراپە ناکات و بەبێ سزا ڕزگاری بێت. خودا هیچ کەسێک ئاسوودە ناکات ئازاری کەسێکی دیکەی دابێت. تەنها هەندێک جار سزاکەی دوا دەخات. بەڵام دڵنیابە گیانیان ناکێشێت بەر لەوەی سزایان بدات.

## بەدڵت بڵێ با کەمێک ئەزموون پەیدا بکات...

تۆ کەی ئاقڵ دەبیت؟ کەی فێردەبیت خەڵکی بناسیت؟ هەردەم بەم جۆرە درەنگ لە ئامانجی ڕاستەقینەیان تێدەگەیت؟ بڵێ، بێزار نەبوویت هێندە بڵێیت خۆزگە...خۆزگە! بڵێ ماندوو نەبوویت لە خەم خواردن؟

فێربە ئیتر، هەموو کەس خاوەن هەمان کەسایەتی نییە! چەند کەسی باش هەبێت هێندە خراپیش هەیە. هێندەی کەسی ڕاستگۆ هەیە کەسی درۆزنیش هەیە! زۆر بە خێرایی باوەڕ بە خەڵکی دەکەیت، زۆر خێرا متمانە دەکەیت. لە کۆتاییشدا هەر هەڵدەخەڵەتێیت. دەبێت ئیدی فێربیت خەڵک بناسیت.

گەر دەتەوێت ژیانت ڕێکبخەیتەوە و جارێکی دیکە خەمبار نەبیت؛ بەم جۆرە نابێت، بڕوا بە هەموو کەس مەکە، هەموو زەردەخەنەیەک بە ڕاست مەزانە، بە دوو قسەی جوان خێرا مەخەڵەتێ. گەر کەمێک ئەقڵت هەبێت گومان لە سێبەری خۆشت دەکەیت.

لە یادی مەکە، ئێستا کەم لەم دۆخەدایت، بەهۆی ئەوەیە کە هەموو شتێک بە ڕاست دەزانیت و بە هەموو قسەیەکی جوان دەخەڵەتێیت. پێویستە چیدی ڕێگە نەدەیت خەڵکی نیەتە باشەکانت بە خراپ بەکاربهێنن. تۆ فریشتە نیت! بە دڵت بڵێ با لە هەڵەکانی ڕابردووت فێرببێت و کەمێک ئەزموون پەیدا بکات ...

**"پێتناڵێم ببە بە کەسێکی خراپ، بەڵام پێتدەڵێم ئاگادار بە لە دونیادا کەسانی خراپیش هەن"**

## بە خودایان بسپێرە...

دەزانم زۆر لێی تورەیت، ناتوانیت قبوڵی بکەیت کە درۆی لەگەڵت کردووە و تۆی هەڵخەڵەتاندووە. دەتەوێت ئەو چۆن تۆی خەمبار کرد و چی بەسەرهێنایت هەمان شتی بەسەربهێنیتەوە و پەشیمانی بکەیتەوە لەوەی کە کردوویەتی. کاتێک بیرت دەکەوێتەوە چی بەرامبەرت کردووە تووڕە دەبیت، ئارەزوو دەکەیت تۆڵەی لێبکەیتەوەو ناخی بسوتێنیت.

بەڵێ، مافی خۆتە. دەکرێت ئەو هێندە خراپ بێت شایەنی تۆڵە کردنەوەی زیاتر بێت، دەکرێت شایەنی ئەوەبێت زیاتر لە زۆر ئازاری بدەیت، بەڵام تۆ شایەنی ئەوە نیت خراپە بکەیت و خۆت گوناهبار بکەیت. بۆیە دەتوانیت لەجیاتی تۆڵەکردنەوە بە خودای بسپێریت. بەم جۆرە هەم بەهۆی ئەوەوە توشی گوناهنابیت هەم تۆڵەکەت لە دەستێکی بەهێزدایە.

لە یادت نەچێت، وازهێنانی تۆ لە تۆڵەکردنەوە بەو واتایە نایەت کە ئەو بەخشراوە. بێگومان ڕۆژێک باجی ئەو خراپانە دەدات کە بەرامبەر بە تۆ کردویەتی. وە تۆش بێگومان پاداشتی ئەو ئارامگری و نیازپاکییەت وەردەگریت، پاداشتی وازهێنان لە تۆڵە کردنەوە وەردەگریت... هەردەم لە یادت بێت گەورەترین تۆڵە ئەوەیە بە بێدەنگی ئەو کەسانە بە خودا بسپێریت کە خراپەت بەرامبەر دەکەن..

**"خەمبار مەبە، ئەوانەی ئازارت دەدەن بەبێ ئازار چەشتن نامرن، وە ئەو کەسانەی دەبنە هۆی ڕشتنی دڵۆپێک فرمێسکت هەرگیز زەردەخەنە بە ڕوخساریانەوە نابینرێت"**

## ژن، پیاو، عەشق...

عەشق لە پێکەنینی ژن و لە فرمێسکی پیاودا دەردەکەوێت. چونکە ژن تەنها بۆ ئەو پیاوە پێدەکەنێت کە خۆشی دەوێت، وە پیاویش تەنها بۆ ئەو ژنە دەگری کە خۆشی دەوێت. پیاو هەرچەند بەهێزیش بێت هەر پێویستی بە ئەژنۆی خۆشەویستەکەیەتی تا لەسەری بنوێت. ژنیش هەرچەند بترسێت لە پێناو ئەو پیاوەی خۆشی دەوێت هەموو شتێک بە لاوە دەنێت و لە هیچ شتێک ناترسێت. گەر سەیرێکی ئەو کەسانە بکەیت کە عەشق بە خۆشی و بە چێژەوە دەژین سادەیی و ڕاستگۆیی بەدی دەکەیت. ڕاستییەکەی زۆر سەختیش نییە ببیتە کەسێک کە نەتوانن وازتلێبهێنن، پێویست ناکات ببیتە کەسێکی جیاواز لە خۆت و هەوڵی زۆر بدەیت. تەنها ئەوە بەسە خۆت بیت. بۆ نموونە؛ بۆ ئەوەی ببیتە پیاوێک خۆش بویستریێت پێویست ناکات ببیتە سوپەرمان. تەنها ئەوە بەسە پیاوبن. بۆ ئەوەی ببیتە ژنێک خۆشبویستریێت پێویست ناکات وەک شازادەبن، تەنها ئەوە بەسە خانومان بن.

واز لە خۆتان مەهێنن. لە یادت بێت بۆ ئەوەی کەسێک عاشقت بێت خۆت بگۆڕیت و وەک کەسێکی دیکە مامەڵە بکەیت، ئەو

کەسە عاشقی خۆت نابێت تەنها عاشقی ئەو ڕۆڵە دەبێت کە دەیگێڕێت. ئەوسا ناچاردەبیت خۆت ونبکەیت و ببیتە بێگانەیەک. گەر دەتانەوێت پەیوەندییەکی تەندروستتان هەبێت، لە ژندا بۆ زەردەخەنەی ڕاستی، بۆ خاکیبوون، و دروستی بگەڕێن، وە لە پیاویشدا بۆ جدییەت و پێگەشتوویی بگەڕێن. دەبێت هەردووکتان خاوەن کەسایەتی و ڕەوشت و ڕاستگۆیی و سۆزبن.

گەر ئەو کەسەی لەگەڵتانە خاوەن ئەم تایبەتمەندییانە بێت، عەشقەکەتان زۆر جوان و ڕاست دەبێت. بەڵام گەر خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانە نەبێت، ئەم عەشقە زۆر زیانتان پێدەگەیەنێت. وریابن و زۆر بە سەرنجەوە کەسێک هەڵبژێرن، نەوەک ڕێگای بەختەوەریتان لێبگۆڕێت بۆ ڕێگای خەم و ژان.

هەرگیز بۆ دڵخۆشبوون پەلە مەکەن، سەرەتا کەسی بەرامبەرتان بە باشی بناسن. دواتر بڕیار بدەن متمانەی پێبکەن یاخود نا. دواتر بزانن چیان لێتان دەوێت بۆ داهاتوو. گەر کەسی بەرامبەر لەم تاقیکردنەوانە سەرکەوتووبێت بەختەوەری و دڵخۆشی لە ڕێگەتانە.

لە یادی مەکەن، مرۆڤ هێندەی بە خۆشویستران دڵخۆش دەبێت بە خۆشویستن دڵخۆش نابێت. بۆیە دڵنیابن ئەو کەسەی هەڵیدەبژێرن خۆشیبوێن نەک تەنها ئێوە خۆشتانبوێت. بە خۆشویستن دەتوانن تەنها ئەوان خۆشبەخت بکەن، ناتوانن خۆتان خۆشبەخت بکەن.

”بۆ ئەو کەسانەی لە هاوکێشەی خۆشبەختی دەگەڕێن؛ نەفس لە عەشق دەربکەن، لەگەڵ تێگەیشتوویی کۆی بکەنەوە، لێکدانی ڕاستگۆیی بکەن و دابەشی دووی بکەن ... ئەنجامی کۆتایی یەکسانە بە دڵخۆشی“

# کاتی جودایی...

هەندێک جار ڕۆیشتن لە مانەوە زۆر ئاسانترە. زۆر کات جیابوونەوە لە بەیەکەوەبوون زۆر بە ئازارترە. کاتێک ئەو کەسەی خۆشتدەوێت شتانێک دەکات پێتناخۆشە، هێواش هێواش لە پێش چاوت دەکەوێت. کاتێک ئەو شتانەی تۆ پێت گرنگە بۆ خۆشەویستی کۆتایی پێدێت لە پەیوەندییەکەتدا دەبێتە هۆی گۆڕانکاری گەورە لە نێوانتاندا. زۆر خۆشویستن کەموکورتییەکانی پەیوەندییەکان دادەپۆشێت، بەپێی تێپەڕبوونی کات و کەمبوونەوەی خۆشەویستی ئەو لایەنانە دەردەکەون کە لەو ماوەیەدا خەمباریان کردوویت و هەست بەوە دەکەیت کە چەند ماندووبویت.

کاتێک خۆشەویستەکەت بەردەوام هەڵە دەکات و هیچ هەست بە هەڵەکانیشی ناکات، وات لێدەکات تۆ بە تەنیا بەرپرسیارێتی پەیوەندییەکە هەڵبگریت و بەم جۆرەش زۆر ماندوو دەبیت و چیدی ناتوانیت هەوڵ بدەیت بۆ بەردەوامی پەیوەندییەکە. هەست دەکەیت هەرچی بکەیت هەرگیز پەیوەندییەکە وەک جارانی لێنایەتەوە و ئەمەش تێڕوانینت دەگۆڕێت. ئەمانە کۆدەبنەوە و دەتگەیننە دۆخێک لە نێوان سەد هۆکار بۆ ڕۆیشتن هۆکارێک نادۆزیتەوە بۆ مانەوە.

پێشنیاری من بۆ تۆ ئەوەیە؛ گەر هەموو شتێکت کرد کە لە دەستت دەهات بۆ چاکردنەوەی پەیوەندییەکەت، وە هیچ شتێک چاک نەبوو، گەر هەوڵی زۆرتدا و ئەنجامی نەبوو ئەوە واتە کاتی ڕۆیشتنت هاتووە.

لە یادی مەکە، عەشق واتە متمانەبوون بە یەکدی، و تایبەتە بەو کەسەی خۆشیدەوێیت. گەر نەبوو پێویست ناکات زۆری لێبکەیت، چونکە جودایی جوانە کە کاتی هات ...

## مرۆڤ خیانەت لە کەسێک ناکات کە خۆشیدەوێت، نایکات، نایکات!

مرۆڤ خیانەت لە کەسێک ناکات کە خۆشی دەوێت، نایکات، نایکات! دڵخوازی شتی وەها نابێت. با بڵێین مەیلی هەبوو. گەر مەیلیشی هەبێت ناتوانێت بیکات.

مرۆڤ ناتوانێت کەس بخاتە جێگای خۆشەویستەکەی. گەر جارێک بە عەشقەوە دەستی کەسێکی گرتبێت ناتوانێت دەستی کەسێکی دیکە بە عەشقەوە بگرێت جارێکی دیکە. گەر کەسێک بە ڕاستی کەسێکی خۆشبویت هەرگیز مەیلی بۆ کەسێکی دیکە نابێت.

مرۆڤ خیانەت لە خۆشەویستەکەی ناکات، نایکات! هەڵەیەکی بەم چەشنە گەورەی بەرامبەر ناکات. هەرگیز بە ئاسانی کەسێکی دیکە ناخاتە جێگای. گەر عەشق لە دڵیدا هەبێت هەرگیز بە گوێی شەیتان ناکات.

مرۆڤ ئازاری خۆشەویستەکەی نادات. گەر تا قوڵایی ناخی ڕۆچوبێت ئەو خۆشەویستییە، ئەوە هەرگیز وازی لێناهێنێت.

گەر دڵی بە عەشق سوتابێت دڵی کەس ناسوتێنێت. تەنها بۆ جارێک گەرمکردنەوەی نەفسی تا ئەبەد خۆشەویستەکەی بەندی جەهەننەم ناکات.

**لە یادی مەکە، بێنرخترین کەس ئەو کەسەیە کە ناتوانێت بەسەر نەفسیدا زاڵبێت. گەر خۆشەویستەکەت سەیری کەسی دیکە بکات و دەستیان لێبدات، وە تۆش قبوڵی بکەیت، ئەوە بەدەستی خۆت خۆتت کوشتووە. تۆ خۆتبە و لەبەر هیچ کەسێک خۆت مەکوژە.**

## عەشق واتە خۆشویستن بە دڵ و بە ڕۆح

### دەزانن بۆچی ئێستا عەشق بەم جۆرەی لێهاتووە کە کەس متمانەی پێنییە؟

چونکە ئێمەی مرۆڤ هێندەی گرنگی بەوە دەدەین خۆشبویستریێن گرنگی بەوە نادەین کەسمان خۆشبوێت. لەگەڵ دڵی کەسی بەرامبەر ناژین، لەگەڵ جەستەیان دەژین. لەبەر ئەوەی نازانین خۆشەویستی ببەخشین عەشقەکەمان لەناودەچێت. ڕۆژ بە ڕۆژ وامان لێدێت لە عەشق دوردەکەوینەوە.

لە ڕاستییدا پێناسەی عەشق هێندە فراوانە لە کتێبدا جێگای نابێتەوە. هەرگیز ناتوانین سنووری بۆ دابنێین و لە قاڵبدانی کارێکی ڕاست نییە. گەر کەسێک گرنگی بە دڵت نەدات و تەنها گرنگی بە جەستەت بدات، ئەوا ئەو کەسە تەنها جەستەی تۆی خۆشدەوێت. ئەوەشی جەستەی تۆی خۆشبوێت بە ڕاستی خۆشی ناوێێت. لە یادی مەکەن عەشق واتە خۆشویستن بە دڵ و بە ڕۆح.

دەمەوێت ئەوە بزانن عەشق زۆر لە جەستە و بەدەن

گەورەترە. تەنها کەسە تێگەیشتووەکان ئەوە دەزانن کە ناکرێت عەشق بە جەستە سنوردار بکرێت و بە بەدەن تێیدا بژیت. گەر ئەو کەسەی خۆشتدەوێ دڵخۆش نەبێت بەو خۆشەویستییەی تۆ پێی دەبەخشیت، واتای وایە ئەو کەسە پێویستی بەو خۆشەویستیە نییە و داواکاری دیکەی لێت هەیە. گەر بەم جۆرە بەردەوام بیت ئەوە لە خۆشەویستی دەردەچێت و دەبێتە بەرژەوەندیخوازی.

با پێشنیارێکت بۆ بکەم؛
وشەی "زۆر" لە ژیانت بە دوور بگرە.
بۆ نموونە؛ هیچ کەسێکت "زۆر" خۆشنەوێت.
"زۆر" بیری کەس مەکە.
"زۆر" متمانە بە کەس مەکە.
"زۆر" فیداکاری مەکە.
لە یادی مەکە؛
گەر ئەم وشەیە لە دڵت دەر نەکەیت، لە داهاتوودا زۆر ئازار دەکێشیت...

## بینینی ڕاستییەکان...

خەم بۆ کۆتاییەکان مەخۆ، بێگومان خێری تێدایە. بەڵکو خودا ڕێگەی لە ڕووداوی زۆر خراپتر گرتبێت بەو کۆتاییانە. هەم کێ دەزانێت داهاتووت باشتر نابێت؟

بۆچی بە خۆڕا خۆت خەمبار دەکەیت؟ تۆ نەبوویت نزات دەکرد خودا چی خێری تێدایە ئەوەت بۆ بکات؟ نابینیت هەموو ئەو شتانەی لێت دورخستەوە کە خێری تێدا نەبوو...

لە یادی مەکە؛ هەندێک جار خودا ڕێگە دەدات ئازار بکێشیت هەتا ڕووی ڕاستی کەسانێکت بۆ دەربکەوێت. بۆ ئەوەی لە هەموو شتێک جوانتر تێبگەیت ڕێگە دەدات کەمێک زیاتر فرمێسک بڕێژیت. بۆ ئەوەی لە کەسە ساختەکان ڕزگارت ببێت ڕۆژانێکی سەختت نیشان دەدات. بەڵام بزانە هەموو ئەمانە لە پێناو ئەوەن ڕاستییەکان ببینیت.

گلەیی مەکە، سوپاسگوزار بە! دڵنیابە گەر خودا خۆشی نەویستیتایە هیچ کاتێک ئەم ڕاستییانەت نەدەزانی. دەکرا ئەوان بەردەوام بتخەڵەتێنن و بەکاریان بهێنایتایە، وە تۆش هیچ بە ڕاستییەکانت نەزانیایە.

خەم مەخۆ! خودا لە کەسە خراپەکان دورت دەخاتەوە بۆ ئەوەی لە کەسە باشەکان نزیکت بکاتەوە. خودا ڕاستییەکانت نیشان دەدات و بە دڵخۆشی ڕاستەقینەت دەگەیەنێت.

## خەم مەخۆ! خودا هەمووی دەبینێت...

کەسێک زۆر خەمباری کردیت، درۆی لەگەڵ کردیت، بەکاریهێنایت، یاری بە خەیاڵەکانت کرد. خۆشەویستییە درۆینەکەی تاقولایی ناخت ڕۆکرد، تۆی خەڵەتاند، وە دواتر وەک ئەوەی هیچ شتێک نەبووبێت بەجێی هێشتیت. هیچ بیری لەوە نەکردەوە تۆ چیت بەسەردێت کاتێک لەگەڵ خەیاڵەکانت بەجێی هێشتیت.

گیانت دەسوتێت و ناخت قوڵپ دەدات، وا بیردەکەیتەوە شایەنی ئەمانە نەبوویت، بۆت قبوڵناکرێت...

سەرەڕای ئەوەی ناخیشت دەسوتێت ئارام دەگریت، سەرەڕای ئەوەی ڕاستییەکانت بۆ قبوڵناکرێت بێدەنگ دەبیت. سەرەڕای ئەو هەموو ئازار و خەمە نزا دەکەیت. سوپاسگوزاری خودایت لە کاتێکدا وابیردەکەیتەوە شایەنی هیچ کام لەو خەمانە نەبوویت. خەم مەخۆ! خودا هەمووی دەبینێت، دەزانێت تۆ لە چیدا دەژیت و ئەوان چیان بەرامبەرت کرد.

تۆ ناخت ئاسوودەبێت!

هیچ کاتێک مافت ناخورێت و هیچ تاوانێک بێ سزا نامێنێتەوە.

بە خودایان بسپێرە، با ئەو تۆڵەت بۆ بکاتەوە ...

## شایەنی ئەوەیە لە یادت بێت؟

خۆشتویست، گرنگیت پێدا، خاوەنداریت کرد.

بۆ دڵخۆشکردنی ئەو هەموو شتێکت کرد.

خەمبار بوویت، شکایت، بەڵام دیسانەوە لێیخۆشبوویت.

لە خۆشویستن زیاتر هیچ شتێکت نەویست...

تۆ کە گرنگیت پێدا و هێندە خۆشتویست، ئەو ئەم گرنگییەی لە دژت وەک چەک بەکارنەهێنا؟

لە هەموو کەس زیاتر متمانەت پێی هەبوو، متمانەتی لەدەست نەدا؟

دیسانەوە لێیخۆشبوویت، ئەی ئەو بە هەڵەکانی زانی؟

واز لەوەش بهێنین، یەکجار هەر یەکجار، بۆ تەنها جارێک گرنگی بە خەم و کێشەکانت دا؟

یەک جاریش بێت هەوڵی دا دڵخۆشت بکات؟

تۆ بەرگەی ئەوت گرت، ئەی ئەو بەرگەی تۆی گرت؟

هەمووی بخەرە لایەک،

ئەم کەسە کە ناتوانیت لە یادی بکەیت، شایەنی ئەوەیە لە یادیشت بێت؟

## ناتوانم واز لە باشبوون بهێنم...

زۆر بە ئازارە کاتێک دەبینم پاشماوەی هیچ بێگانەیەکم پێوە نییە، هۆکاری هەموو برینەکانم کەسە نزیکەکانمن. ئەو کەسانەی سوپاسم کردوون بۆ هەبونیان، لە هەموو کەس زیاتر ئازاریان داوم. هەردەم لەلایەن ئەو کەسانەوە خەڵەتێندراوم و فێڵم لێکراوە کە زۆرترین متمانەم هەبووە پێیان. هەموو ئەو کەسانەی سوپاسگوزاربووم بۆ ئەوەی لامبوون، لەبەر بەرژەوندییەکانیان لەلامبوون. کەس لە دەورم نەماوە نییەتە باشەکەمی بەکارنەهێنابێت. لەمەودوا متمانە بە کەس ناکەم ...

هەرچۆنێک بێت، ئەو کەسانەی کە پارێزگاریم لێدەکردن و دەمگوت؛ "ئەو خراپەم بەرامبەر ناکات، ئەو درۆ ناکات، ئەو فێڵم لێناکات"، ئاسەوارێکیان لەسەر دڵم بەجێهێشتووە وەک ئەوەی واژۆی ئەوەیان کردبێت من جارێکی دیکە متمانە بە کەس نەکەم ...

بۆچی ئەو کەسانەی درۆکردنیان کردووەتە پیشە و خەڵکی بەکاردەهێنن زۆر بەختەوەرن و ئەو کەسانەی کە نیازیان باشە و دڵیان پاکە هەردەم ئازار دەکێشن؟ دەکرێت هێندە باشبوون بەو

ڕادەیەی خراپەی کەسانی دیکە نەبینیت خراپ بێت؟

هەمیشە بە هەڵەدا دەچم، ڕاستییەکان نابینم. وا هەستدەکەم من کەسێکی زیاد لە پێویست نەفامم. چونکە ناتوانم کەسە باشەکان هەڵبژێرم. گەر پێشم بڵێن من چۆن دەبمە کەسێکی خراپ، من هەرگیز ناتوانم واز لە باشبوون بهێنم.

## دەزانیت خۆشویستن چۆنە؟

خۆشویستن بەم جۆرەیە، ئەو درۆت لەگەڵ دەکات، دەیزانیت بەڵام هەر دەتەوێت باوەڕی پێبکەیت.

دەشزانیت بە هەدەری دەدات، بەڵام دیسانەوە شانسی پێدەدەیت..

ئاشکرایە ئازارت دەدات، دەزانیت..

بەڵام بەردەوام دەبیت لەوەی خۆت فیدا بکەیت.

دەزانیت شایەنی تۆ نییە، بەڵام هەر دەتەوێت لە لاتبێت.

دەزانیت هەڵەت بەرامبەر دەکاتەوە

بەڵام دیسانەوە لێی دەبووریت.

دەمەوێت ئەوەت پێبڵێم؛ خۆشویستن وەک ئەجەل وایە

دەزانیت دەمریت

بەڵام ناتوانیت وازبهێنیت...

**"خۆشویستن شکستهێنانە بەرامبەر بە کەسێک، بە ویستی خۆت، سەرەڕای ئەوەی دەتزانی"**

## ژنەکان...

سەیرکە دۆستەکەم، ژنەکان هەر زوو ماندوونابن، وازناهێنن، کۆڵنادەن. لە هەموو شتێک زیاتر گرنگی بەو کەسە دەدەن کە دڵیان لەگەڵ بەشدەکەن. زۆر باش دەزانن چۆن بۆ ئەو کەسە بجەنگن و هەوڵبدەن کە خۆشیان دەوێت. ئەگەر بابەتەکە خۆشەویستەکەیان بێت چاویان هیچ شتێک نابینێت.

دژی هەموو شتێک لەگەڵت دەجەنگن. هەموو ڕێگایەک تاقیدەکەنەوە بۆ دڵخۆشکردنت. تەنانەت هەموو دونیا بەکۆڵدەگرن لەبەر تۆ و ناڵێن ماندووبووین. گەر ژنێک پێت بڵێت ماندووبووم دڵنیابە زۆر ئازارتداوە و خەمبارت کردووە.

ئەوە لە یاد مەکە، گەر ژنێکت دوور لە هەموو بەرژەوەندییەک و ئارەزوویەک وە تەنها لەبەر خودی خۆی خۆشبوێت هێدی هێدی ژیان بە ڕەنگاوڕەنگتر دەبینیت. چونکە گەر ژنێک بزانێت بەبێ هیچ بەرژەوەندییەک خۆشدەویسترێت دەبێتە خاوەن هێزێک هەموو دونیات لێ ڕەنگاوڕەنگ بکات.

**"ژنەکان خەمبار مەکەن، چونکە ژن ئەمانەتی خودایە لای ئێوە. ئەوەی بە باشی ئاگای لە ئەمانەتی خودا نەبێت، بێگومان خودا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات".**

## بە خراپە ئەو کەسانە بەکارمەهێنن کە باوەڕیان بە عەشق هەیە...

ڕاستگۆبە لەگەڵ خەڵکی، هیچ کەسێک لە نیوەی ڕێگادا بەجێ مەهێڵە کە متمانەی پێتە.

دروستبە لەگەڵ خەڵکی، ئاهی ئەو کەسانە هەڵمەگرن کە بە ڕاستی گرنگیتان پێدەدەن.

بەشەرەفبە لەگەڵ خەڵکی، بە خراپە ئەو کەسانە بەکارمەهێنە کە باوەڕیان بە عەشق هەیە.

بەڕێزبە لەگەڵ خەڵکی، بوختان بۆ کەسانێک مەکەن کە بەڕاستی خۆشیان دەوێیت و متمانەت پێدەکەن.

نیازت پاکبێت، بەڵام ڕێگا مەدە کەس نیازە پاکەکەت بە خراپی بەکار بهێنێت.

لێبووردەبە، بەڵام ڕێگا مەدە کەسێک هەمان هەڵەت چەندین جار بەرامبەر بکاتەوە.

لە پشت خەڵکی بووەستە، بەڵام ڕێگا مەدە کەس لە پشتەوە لێت بدات.

ببە جێگای متمانەی خەڵکی، بەڵام بە ئاسانی متمانە بە هەموو کەسێک مەکە کە دێتە ڕێت.

خەڵکی چۆن مامەڵەت لەگەڵ دەکات با بیکات. تۆ هەمیشە بەردەوامبە لە چاکەکردن لەگەڵیان. هەرچی ڕوودەدات با ڕووبدات، واز لە چاکەکاری مەهێنن.

لە یادی مەکەن، کەسە باشەکان یەکجار [illegible] بەڵام ئەم سەرکەوتنە لە هەموو دۆڕانەکانیان گەورەترە. کەسە خراپەکانیش یەکجار دەدۆڕێن، بەڵام ئەم دۆڕانە زۆر بە ئازارە

## پیاوە بەسۆزەکان...

ژنەکان، گەر بڕیارە پیاوێکتان خۆشبوێت، پیاوێکی بەسۆزتان خۆشبوێت. چونکە پیاوە بە سۆزەکان بەجێتان ناهێڵن. هەرگیز پشتتان لێناکەن، تەنانەت ناشزانن خیانەت چییە. گەر دەتانەوێت زۆر خۆشبویسترێن و دڵخۆشبن پیاوێکی دڵنەرم هەڵبژێرن. چونکە پیاوی دڵنەرم بشیەوێت ناتوانێت خەمبارت بکات، بتشکێنێت، یاخود زیانت پێبگەیەنێت. بۆ ئەوان تەنها پێکەنین و دڵخۆشیت گرنگ نییە، بۆ ئەوان فرمێسکەکانیشت گرنگە. هەرگیز نایانەوێت بتخەنە گریان. زۆر باش دەزانن خۆشەویستی و ڕێز چییە. تەنها لە ڕۆژە خۆشەکان لەگەڵت نین، لە ڕۆژە ناخۆشەکانیش لەگەڵتن. بەرامبەر هەموو ناخۆشییەک دەبنە قەڵغان. ڕێگا نادەن کەس قسەتان پێبڵێت. هێندە پەیوەست دەبن بەو کەسەی کە خۆشیاندەوێت واز لە خۆیان دەهێنن، بەڵام واز لە ئەو ناهێنن.

لە یادی مەکەن؛ بوونی پیاوێکی بەسۆز لە ژیانتان لە هەموو دونیا گرنگترە. بوون بە خاوەنی پیاوێکی بەسۆز لە بوون بە خاوەنی هەموو سەروەتی دونیا باشترە.

**"گەر پیاوێک خاوەن سۆز نەبێت، وەک ئەوە وایە خاوەن هیچ شتێک نەبێت"**

## پەلەمەکە، چاوەڕوانی کاتە ڕاستەکە بکە

### بێزارمەبە!

هەرچەند کاتت لە کەسی هەڵەدا بە هەدەر دابێت هێشتا درەنگ نییە و دوانەکەوتوویت. گەر ئومێدت هەبێت و متمانەت بە خۆت هەبێت دەتوانیت جاریکی دیکە پێبکەنیتەوە و بگەڕێیتەوە بۆ ژیان. دەبێت بڕوات هەبێت کە ژیان تەنها ڕابردوو نییە و داهاتووش بوونی هەیە. دەتوانیت هەموو ئەو بارەگرانەی سەر شانت وازلێبهێنیت و بەرەوپێش بچیت. دەتوانیت هێڵێک بکێشیت بەسەر ئەو ڕووداوانەی ڕوویانداوە و داوای خێر لە خودا بکەیت.

لە یادی مەکە؛ هیچ شتێک تا کۆتایی نامێنێتەوە.

هەموو شتێک کۆتایی هەیە، خەم و ناخۆشییەکانیش کۆتاییان هەیە. تەنها ئەوە بەسە باوەڕت هەبێت کە ڕۆژێک ناخۆشییەکان کۆتاییان دێت. ئەزموون پەیدا بکە و کۆشش بۆ ڕۆژی خۆش بکە.

پێویست ناکات پەلە بکەیت. چونکە کەسە باشەکان پاداشتەکەیان لە کاتێکی ڕاستدا وەردەگرن. بێگومان تۆش ڕۆژێک ڕێت لە کەسێک دەکەوێت کە نرخت بزانێت و بتخاتە پێکەنین و

دڵخۆشت بکات. بێگومان تۆش کەسێک دەناسیت کە لەبەر تۆ واز لە هەموو شتێک بهێنێت.

بێئارام مەبە!

تۆ تەنها بە ئومێد بە، بەردەوامبە لە ژیان و چاوەڕوانی کاتە ڕاستەکە بکە.

**لە تۆ بەهێزترنیم.**
**بەڵام لەتۆ زیاتر باوەڕم هەیە.**
**بۆیە ئێستا تۆ لەسەر زەوی کەوتوویت و من**
**ڕاست بەپێوە وەستاوم.**

کاتی ئەوە هاتووە بیر لە خۆت بکەیتەوە!

لە کوێیت؟

هێشتا خەریکیت ئەو کەسانە دڵخۆش دەکەیت کە شایەنی نین؟

کەی واز لە فیداکاری دەهێنیت؟

ئیدی قبوڵی بکە، هەندێک کەس هەن هەرچییان بۆ بکەیت ناتوانیت دڵخۆشیان بکەیت.

دەستووری دونیا بەو جۆرەیە، ناتوانیت بیگۆڕیت.

دەبێت خەڵکی بەو جۆرە قبوڵ بکەیت کە هەن.

وە دەبێت چیتر گرنگی بە دڵخۆشکردنی خۆت بدەیت.

لە خۆت بپرسە بزانم؛ ویستت هەموو کەس دڵخۆش بکەیت، چی بوو؟

نرختیان زانی؟

دڵخۆشیان کردیت؟

فرمێسکەکانتیان سڕییەوە؟

ئیتر ئەو سەردەمە تێپەڕیوە.

کاتی ئەوەیە بیر لە خۆت بکەیتەوە.

بەشی پێویست خۆت بۆ ئەو کەسانە ماندووکرد کە شایەنیشی نەبوون.

با لەمەودوا ئەو کەسانەی خۆشیان دەوێیت بیر لە دڵخۆشکردنی تۆ بکەنەوە.

## ژنە بەهێزەکان

### ژنی بەهێز کێیە؟

ئەو ژنەی کە هەموو شتێکی بینیوە و ژیاوە، ژنێکی بەهێزە. چونکە ئەو ژنە شت نەماوە بەسەری نەیەت. بەڵام هێشتاش لەسەرپێ وەستاوە.

ژن بەو ڕووداوانەی بەسەری دێت بەهێز دەبێت. هەر ئازارێک دەیکێشێت و هەر خەنجەرێک کە لێی دەدرێت، هەر ڕوخسارێکی ساختە کە دەیبینێت و هەر بێمتمانەییەک کە دروست دەبێت زیاتر بەهێزی دەکات. ئەو ڕۆژەی کە هەست دەکات چیدی ئازار ناکێشێت دەزانێت کە بەهێزبووە.

ئەو ژنانەی ئەمڕۆ بەهێزن هیچ کامێکیان بە ویستی خۆیان بەهێز نەبوون. یان ژیان ناچاری کردووە بەهێزبێت، یان کەسانی دەوروبەری بوونەتە هۆکاری ئەوەی بگاتە ئەو حاڵە. ئەو کەسانەی دەچنە ژیانی ژنێکەوە و ئازاری دەدەن دەبنە نەخشەیەک بۆ بەهێزکردنی ئەو. دوای ئازار و خەیاڵە ڕووخاوەکانی دەکەوێت و هێز دەدۆزێتەوە وە جارێکی دیکە بەبێ چەک بەو ڕێگایەدا ناڕوات.

بۆ ژنەکان هەر دۆڕانێک دەبێتە ئامۆژگارییەک. هەر فرمێسکێک دەبێتە دەستپێکێکی نوێ. چونکە ژن کاتێک هەموو شتێکی لەدەستدا فێردەبێت. ڕۆژێک کە هیچ شتێکی نەما لەدەستی بدات فێردەبێت کە ترس هیچ سوودێکی بۆی نابێت. فێردەبێت کە خەمەکان هیچ شتێکی بۆ چاک ناکەنەوە. فێردەبێت کە هەست و سۆز هاوکاری نابێت هیچ شتێک بباتەوە. فێردەبێت بەو ڕووداوانەی دێنە پێشی یان دەبێت بەهێزببێت یان دەبێت لەناوبچێت.

گەر دەتەوێت کەسێک لە ژیانتدا بێت بەڕاستی گرنگیت پێبدات، لە بری ئەوەی خەم بخۆیت و کۆڵبدەیت دەبێت لە هەڵەکانت فێرببیت، بەهێزبیت و هەوڵ بدەیت بۆ ڕێککردنەوەی ژیانت.

ترسنۆک مەبە، بەهێز بە! چونکە ژن کە بەهێز دەبێت کەس ناتوانێت بەڕێوەی ببات، ئەو دەبێتە بەڕێوبەر، کوێرانە عاشق نابێت، بەڵکو هەموو شتێک بە ڕوونی دەبینێت و ناچەوسێنرێتەوە.

مەحاڵە بتوانن ژنێکی بەهێز بەکاربهێنن و یاری بە هەستەکانی بکەن. هەموو شتێک لەژێر کۆنترۆڵی ئەودا دەبێت. ئەو کەسانەی دەچنە ژیانیەوە یان دەبێت بەڕاستی خۆشیانبوێت یان دەبێت نەچنە ژیانییەوە.

لەیادی مەکەن؛ ژنە بەهێزەکان بە ئاسانی ناترسن. چونکە ئەوان کۆمەکی کەسیان پێویست نییە. ژنە بەهێزەکان زۆر بەباشی دەزانن چۆن لەسەر پێی خۆیان بوەستن. ژنە بەهێزەکان بە ئاسانی ناخەڵەتێن، چونکە ئەوان زۆر بەباشی دەزانن ڕاستی و ڕیایی چییە. هەروا بە ئاسانی بڕوا بە کەس ناکەن.

## خۆشویستن...

خۆشویستن زۆر لە ناسین زیاترە. خۆشویستن گۆڕینەوەی جێگای دوو دڵە. لە یادنەکردنی بۆنیەتی. خۆشویستن ئەوەیە هەموو هێڵەکانی دەستی و هەموو چرچییەکانی دولبەر بزانیت. بەندکردنی دەنگ و هەناسەیەتی لە سینەتدا. خۆشویستن ئەوەیە شێوەی قژ و نینۆکەکانیت لە دڵتدا هەڵگرتبێت.

خۆشویستن، یەکبوونە لەگەڵ ئەو لە هەموو دۆخێکدا، جەنگینە لە دژی هەر بەربەستێک کە دێتە بەردەمتان. گەر ڕۆژێک ژیان بشتانشکێنێت ئێوە هەر هەمان پارچە دەبن.

نازانم دەبێت چۆن پێناسەی خۆشویستن بکرێت، بەڵام گەر بۆنی خۆشەویستەکەم بکەن بە مەدالیا بە دەنکۆڵەیەک لمەوە و ئەو دەنکۆڵەیە ببەنە بیابانێکەوە بێگومانم ئەو بۆنە دەدۆزمەوە. گەر دەنگی دڵی هەموو خەڵکی سەر زەوی گوێبیست ببم، دەنگی دڵی ئەو هەر دەناسمەوە. گەر چاوم ببەستن و دەستی هەموو دانیشتوانی گەردوون بکەنە دەستمەوە، من دەستی ئەو هەر دەناسمەوە. گەر هەموو دونیا هەناسەی بچرپێنێت بە

گوێیەکانمدا من دەنگی هەناسەی ئەوم لێ ون نابێت. گەر قژی هەموو مرۆڤەکان بەدەستم شانە بکەن من تاڵە قژەکانی ئەو هەر دەناسمەوە.

**لە یادی مەکەن؛ خۆشویستنی**
**کەسێک وازهێنانە**
**لە خۆت و بوونە بە ئەو.**

## متمانە لە عەشق گرنگترە...

مرۆڤ کاتێک تێدەگات کەسێکی هەڵەی خۆشویستووە خەم دەخوات، وێران دەبێت، لە خۆی تورە دەبێت. بەڵام بەپێی تێپەڕبوونی کات لە یادی دەکەن و چاوەڕوانی کەسە ڕاستەکە دەکەن. گەر جارێکی دیکە متمانە بە کەسێکی هەڵە بکەنەوە بۆ هەمیشە متمانە بە کەس ناکەنەوە.

دڵ، لەبەر ئەوەی سەرچاوەی هەستیارییە، هەموو ساتێک ئامادەیە بۆ عاشق بوون. بۆیە دەکریت زۆر بە ئاسانی بەدەست بهێنرێت. متمانە چەقی ئینسانیبوونە، لەگەڵ گومان پێکەوە هاتوونەتە بوون. بۆ بەدەستهێنانی متمانەی کەسێک کاتێکی زۆرت پێویستە. لە یادت بێت بۆ عاشقبوونی کەسێک یەک خولەک بەسە، بەڵام بۆ بەدەستهێنانی متمانەی کەسێک تەمەنێک پێویستە. وێنای خانوویەک بکەن لە مێشکتاندا، عەشق وەک پەنجەرەکانی ئەو خانووەیە، گەر یەکێکیان دابخرێت دەتوانیت لەوانی دیکەوە بچیتە ژوورەوە. متمانەش وەک دەرگای ئەو خانووەیە، گار جارێک بە ڕووتدا دابخرێت جارێکی دیکە ناتوانی بڕۆیتە ژوورەوە. لەبەر

ئەم هۆکارەیە دەڵێین متمانە لە عەشق گرنگترە.

تۆ خۆتبە؛ ببە بە هۆی بێدەنگی، تووڕەیی، یاخود شکانی کەسێک، ببە بە فرمێسک، ئازار، تەنانەت ببە بە هۆکاری ڕووخانی خەیاڵەکانی، بەڵام هەرگیز مەبە بە هۆکاری پەشیمانبوونەوەی لەوەی کە متمانەی پێتکردووە. چونکە ئەوە بزانە مرۆڤ ئەو کەسە دەبوورێت کە خەمی دەداتێ، بەڵام هەرگیز لەو کەسە خۆشنابێت کە متمانەی لەدەستداوە.

## هیچ بەهانەیەک لە عەشق گەورەتر نییە...

عەشق بریتییە لە پێشبڕکێی دڵخۆشکردنی یەکدی. گەر کەسێک بە ڕاستی کەسێکی خۆشبوێت و گرنگی پێبدات هەموو هەوڵێک دەدات بۆ ئەوەی لەلای بێت و دڵی خۆش بکات، گەر پێنجی بەیانی بێت یان نیوەی شەو، گەر لە شارێکی دیکەبێت یان لەوپەڕی دونیا بەلایەوە گرنگ نابێت. چونکە ئەو کەسانەی کەسێکیان خۆشدەوێت دەزانن عەشق لە کات و دووری زاڵترە...

گەر کەسێک خۆشەویستییەکەی تەواو نەبێت یاخود لەبەر ئامانجی دیکە لەگەڵتدا بێت کە بێزاربوو تاڵی قژیشت دەکاتە بەهانە. گەر شتێکی بەدڵ نەبێت هەر زوو بەهانەت پێدەگرێت. درۆ گەرەترین چەکی ئەوانە، وە زۆر بەباشی دەتوانن ئەو چەکە بەکاربهێنن. بۆ نموونە سەرنج بدەن، کاتێک بیری دەکەیت یان دەتەوێت بیبینیت دەڵێت کە ئیشی هەیە، یانیش باسی ڕوودانی شتانێک دەکات کە ڕوویان نەداوە. کاتێکیش پێکەوەن هاوارت بەسەردا دەکات، سوکایەتیت پێدەکات. بچووکت دەکاتەوە! خەیاڵ و دڵخۆشییەکانتی بەلاوە گرنگ نییە، چونکە لەلای ئەو عەشق لەسەر خۆشەویستی بەند نییە، لەسەر بەرژەوەندی بەندە.

لە یادی مەکەن؛ هیچ بەهانەیەک لە عەشق گەورەتر نییە، گەر کەسێک بەردەوام بەهانە بهێنێتەوە ئەوە یان هەرگیز خۆشی نەویستوویت، یان خۆشەویستییەکەی کۆتایی هاتووە.

## بەڵێ دۆڕام!

بردنەوە لە عەشقدا؛ بۆ ئەو کەسە دووڕووانەیە کە لە بەر پلان و بەرژەوەندییەکانی خۆیان خۆشەویستی دەکەن.

دۆڕان لە عەشقدا؛ بۆ ئەو کەسانەیە کە بەبێ بەرژەوەندی و هۆکار کەسێکیان خۆشدەوێت. بۆ ئەو کەسانەیە کە دەزانن خۆشەویستی ڕاستەقینە چۆن دەکرێت.

تۆ بردتەوە! چونکە بە ئامانج و ئاواتەکانت گەیشتیت، وە من دۆڕام بەڵێ دۆڕام!

دۆڕام، چونکە من کەس بەکارناهێنم، ناتوانم یاری بە هەستی کەس بکەم. درۆ لەگەڵ کەس ناکەم و خەیاڵی کەس ناڕوخێنم. ژیانی کەس لەناو نابەم و دوعای کەس ناهێنمە سەر خۆم. ناتوانم بەرژەوەندی خۆم پێشبخەم و داهاتووی کەس لەناو ببەم. ناتوانم سوود لە هەستەکانی وەربگرم و بەجێی بهێڵم ... مەبەستم ئەوەیە من کەسێکم باوەڕم بە عەشق هەیە، گرنگی بە خۆشەویستی دەدەم، تەنانەت ئازاری مێرولەیەکیش نادەم. ناتوانم هەرگیز وەک تۆ کەسێکی دووڕوو و خراپ و درۆزن بم.

تۆ ئێستا کە هەموو ئەمانەت کردووە بەبێ ئەوەی هیچ شەرم بکەیت، یان بەبێ ئەوەی یەک تۆزیش بێت ڕووخسارت سور هەڵگەڕێت دەڵێیت من بردمەوە. گەر بردنەوە کردەوەکانی تۆبێت من بۆ هەمیشە ڕازیم بە دۆڕان.

**"مرۆڤ ئەو ڕۆژە دەبەزێت کە هەستی بۆ دروست دەبێت، نەوەک ئەو ڕۆژەی بەجێدەهێڵرێت"**

## گەر ئەو هۆکاری بێئومێدیت بێت...

خودا هۆکارە بۆ ئومێدەواربوونت
خراپەت بەرامبەر کرا؟
هەست و سۆز و ویژدانتیان بەکارهێنا؟
یان وا بیردەکەیتەوە شایەنی ئەو شتانە نەبوویت کە تێیدا ژیایت؟

هەرکامێک لەمانە ڕاستبن؛ گرنگ ئەوەیە تۆ ویژدان و باوەڕ و باشییەکانی ناو دڵت بپارێزیت. وازمەهێنە لە باشبوونت، چونکە خودا زیاد لە پێویست دەبەخشێت بەو کەسانەی نیازباشن. گرنگیت بە کەسێکدا، وە بەهەڵەدا چوویت، لەوانەیە پاداشتی ئەو چاکەیە لە دڵێکی دیکەوە وەربگریت. بەڵێ، دڵپاک و بەسۆزبوویت، وە زۆر باجی ئەوانەت داوە. ڕەشبین مەبە، لەوانەیە ئێستا نۆرەی وەرگرتنەوەی پاداشتت بێت. تۆ ناخت ئاسوودەبێت. چونکە شتە باشەکان دوادەکەون، بەڵام هەر ڕۆژێک بێت دێن.

لە یادی مەکە؛ ئەو هەرچەند بووبێتە هۆکار بۆ دڵتەنگیت الله هێندە هۆکارە بۆ ئەوەی بە ئومێدبیت. ئەو هەرچەند گرنگیت پێنەدات، الله زیاتر دەتپارێزێت. لەبەر ئەوەی متمانەت بەو کرد خەمباربوویت، ڕووخایت و وێران بوویت. لەمەودوا متمانە بە خودا بکە بۆ ئەوەی هیچیتر خەمبار نەبیت.

”کەوتیتە ناو هەرچییەکەوە

کێشە نییە،

گەر سپی بێت، لە تاریکیشدا

هەر دەبینرێیت“

## سوپاسکردنی هەڵەکانمان...

ناتوانیت لە عەشق هەڵبێیت. هەرچەند دەتەوێت دووربکەویتەوە دووربکەوە، ڕۆژێک دێت کەسێکت بەدڵ دەبێت و خۆشتدەوێت، وە دوای هەستەکانت دەکەویت. هەرچەند گومان دەکەیت بیکە، دوای خۆشەویستیت دەکەویت و خەیاڵی گەورە گەورە دەکەیت. چەند ئاقڵ بیت سەر بۆ دڵت دەنەوێنیت و بەبێ بیرکردنەوە بڕیاری هەڵە دەدەیت. عەشق بە جۆرێکە ناتوانیت لێی هەڵبێیت، وە مرۆڤیش زۆر مەیلی بۆ هەڵەکردن هەیە، بەم شێوەیە عەشق دەبێتە هۆکاری هەڵەکردنمان.

ئێستا تۆ خۆت تاوانبار دەکەیت، وا مامەڵە دەکەیت وەک ئەوەی کۆتایی دونیا بێت. وەها بیردەکەیتەوە هەموو کەس وەک ئەو درۆزن و فێڵبازە. وا دەزانیت جارێکی دیکە کەست خۆشناوێت و پێناکەنیتەوە و دڵخۆش نابیت. بەڵام هیچ شتێک وەک ئەوە نییە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە. ژیان کەسی باشیشی تێدایە، بە خۆڕا خۆت پارچە پارچە کردووە.

تۆ پاکترین کاری ئەم دونیایەت کرد، "خۆشتویست".. ئەویش ئەمەی بەکارهێنا. ویستی نیازە پاک و هەستە پاکەکانی تۆ بۆ بەرژەوەندییە پیسەکانی خۆی بەکاربهێنێت. تۆ خەم مەخۆ، هەموو ئەمانە وەک ئەزموون ببینە...

لەبیرت نەچێت! تۆ نەدۆڕایت، فێربوویت خراپە چییە. ئێستا زۆر باش دەزانیت کێ بە چ نیازێک لێت نزیک دەبێتەوە، دەزانیت کێ بە نیازی خراپ و کێ بە نیازی باشەوە دێت.

ئێستا دەتوانیت ڕاست و درۆ لەیەک جودا بکەیتەوە و دڵە پاکەکان دەناسیتەوە. وە ڕۆژێک دێت سوپاسی هەموو ئەم هەڵانەت دەکەیت کە تۆیان فێرکرد ڕاستی چییە.

# عەشق لەم ڕۆژگارەدا

## عەشق...

چەند وشەیەکی سیحراویە، وانییە؟ ئەو هەستە تایبەتەی هەمووومان دەخوازین هەمانبێت. مرۆڤ کاتێک دەشیخوێنێتەوە هەیەجان دەیگرێت. گەر بمانەوێت بە تێروتەسەلی تێیدا بژین تەمەنێکی دەوێت!

ئێستا گەر لەسەر شەقام لە خەڵک بپرسین عەشق چییە، دەڵێن خۆشویستنە، خاوەنداری کردنە، گرنگی پێدانە، غیرەکردنە، یانیش دەڵێن دڵخۆشکردنە. دەکرێت بۆ پێناسکردن ڕاستبێت، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە. عەشق لەم ڕۆژگارەدا هیچ وەک پێناسەکەی نییە، بگرە بە پێچەوانەشەوە، زیاتر دڵشکان و ئازاردان و خەمخواردنە. ئەوەی ئێمە چاوەڕوانین لە عەشق زۆر جیاوازە لەوەی کە تێیدا دەژین. بەداخەوە هەمیشە ئەو کەسانەی کە بە ڕاستی خۆشەویستی دەکەن ڕێیان لەو کەسانە دەکەوێت کە بەرژەوەندیخوازن. هەرچی دەکەین ناتوانین کەسە باشەکان

پێکەوە کۆبکەینەوە، وە ناتوانین خۆشەویستی بە ویستی خۆمان بکەین.

ئەو عەشقانەی کە چیرۆکەکانیانمان خوێندوەتەوە، یاخود لە باب و باپیرانمانەوە گوێبیستیان بووین لەم ڕۆژگارەدا نەماون. عەشق ئیدی وەک جاران پاک نییە. چونکە ئێستا عەشق بەبێ بەرژەوەندی و پیسی بوونی نییە. ئێستا عەشق بوەتە حەشارگەیەک بۆ حەشاردانی درۆو بەرژەوەندی و ویستە خۆپەرستانەکانمان. ئێستا عەشق بوەتە چەکێک، بۆ کوشتنی یەکدی بەکاری دەهێنین. تەنها ئەوەی دەزانێت عەشق بە ڕاستی چییە لە نرخ و بەهای تێدەگات. بەڵام زۆر کەس نرخی نازانێت، زۆر هەوڵدەدات ئەو هەستەی هەبێت، بەڵام کە دەستی دەکەوێت زۆر دەگۆڕێت و نانکوێر و سپڵە دەردەچێت. کاتێکیش لەدەستی دەدات لە جیاتی ئەوەی لە هەڵەکەی بگەڕێت سوچ و تاوانەکە دەخاتە یەخەی کەسێکی دیکە. بەهۆی ئەم کەسانەوە عەشق گەیشتۆتە ئەم حاڵە و ئەو کەسانەی بە ڕاستی باوەڕیان بە عەشق هەیە چیدی متمانە بە کەس ناکەن.

دەزانیت بۆچی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا عەشقی ڕاستەقینە بوونی نەماوە؟

چونکە تەنها یەک کەس بەرپرسیارییەتی هەڵدەگرێت. وە دەبێت بەردەوام ئەو بارەی لەسەر شان بێت. لە پەیوەندییەکاندا کەسێکیان زۆر ئاسوودەیە و کەسەکەی دیکە لە ژێر باری پەیوەندییەکەدا لەناو دەچێت. هەمیشە ئەو کەسانە دەبینەوە کە

هیچ شتێک ناکەن، ئەو کەسانەش دەدۆڕێن کە هەموو شتێکیان کردووە بۆ بەردەوامی خۆشەویستییەکە. ئەوانەی ئەوی دی دڵخۆش دەکەن دەگرین و ئەوانەی ئەوی دی دەگریەنن پێدەکەنن. ئەوانەی گرنگی دەدەن بێنرخ دەبن و ئەوانەی گرنگی نادەن بە نرخ دەبن. دڵە باشەکان بەهۆی دڵە خراپەکانەوە دەمرن و دڵە خراپەکان بەهۆی دڵە باشەکانەوە زیندوو دەبنەوە. لەم ڕۆژگارەدا عەشق هێندە زاڵمە ئەو کەسانەی شایەنی عەشقن بەبێ ئەو دەمرن و ئەوانەشی کە شایەنی نین چێژی لێ دەبینن.

لە یادی مەکەن؛ گەر کەسە باشەکان هەل بە کەسە باشەکانی دیکە نەدەن، عەشق بەردەوام پیس دەکرێت. گەر ئێمە و ئەوانەی کە دەمانەوێت بە ڕاستی خۆشەویستی بکەین هەوڵی بۆ نەدەین ئەو کەسانە لەزەتی لێ دەبینن کە شایەنی نین.

## هەندێک کەس بکوژی دڵخۆشی خۆیانن

## خۆشتدەوێت...

لەبەر ئەو هەوڵ دەدەیت و چاو لە زۆر شت دەپۆشیت. چەندین جار دەیبووریت و بەردەوام هەلی دیکەی پێدەدەیت. واز لە ڕاستییەکان دەهێنیت و بەرامبەر خەیاڵەکانیش دەبەزیت. هەرچەند بەرەوپێش دەچیت بچۆ، کاتێک دەزانیت هاتوویتەتەوە سەرەتای ڕێگاکە دەشکێیت، تورە دەبیت، بێئومێدیش دەبیت، بەلام هەرناتوانیت وازبهێنیت. کاتێک ئەو خەمبار دەبێت هەوڵ دەدەیت زیاتر بەرگەی بگریت و بەهێزتربیت. بۆ ئەوەی بزانیت زەرەیەکیش بێت خۆشەویستی تۆ لە دڵیدا هەیە، پێ دەخەیتە جەهەننەمەکەیەوە. ئاگری ناخی خۆت لە یاد دەکەیت و فوو لە کڵپەی ئاگری ئەو دەکەیت.

ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەسوتێیت لە چەوەڕوانی عەشقی ئەودا، و لە کۆتاییدا دەبیتە خۆڵەمێش. هەرچەند بجەنگیت و هەوڵ بدەیت ناتوانیت ڕاستییەکان بگۆڕیت. لە کۆتاییدا تێدەگەیت لە بیاباندا بە بەفر قەڵا بنیاد نانرێت. هەندێک جار هەرچی بکەیت بێهوودەیە، چونکە هەندێک کەس خۆیان بکوژی دڵخۆشی خۆیانن.

**"گەر کەسێک کە شایەنی دڵخۆشییە تەنیابێت، بێگومان لەبەر ئەوەیە کە هەوڵیداوە کەسێک دڵخۆش بکات کە شایەنی نییە"**

## لەبیرکردن کاری عاشقەکان نییە...

گەر بپرسن ئازاربەخشترین شتی دونیا چییە؟ دەڵێم ئەوەیە لەلایەن ئەو کەسەوە خۆشنەویسترێیت کە خۆشتدەوێت. بیربکەوە: ئەو کەسەی تۆ ئامادەیت هەموو شتێک بکەیت لە پێناویدا، هیچ تۆی بە لاوە گرنگ نییە. هیچ چارەیەکت نییە بێجگە لە لەیادکردن، بەڵام ئەو خۆشەویستییەی بۆ ئەوت هەیە ڕێگرە لەوە. بەردەوام لە نێوان لۆژیک و هەستەکانتدا دێیت و دەچیت. ئەمە بەراستی زۆر بە ئازارە.

کاتێک کەسێکت خۆشدەوێت زۆر سەختە هەوڵ بدەیت لەبیری بکەیت. سەرکەوتن مەحاڵە. هەرچی دەکەیت بیکە، هیچ ناکەیت بە هیچ، چونکە مرۆڤ ناتوانێت بە ئاسانی ئەو کەسە بسڕێتەوە کە لە سەر دڵی هەڵکۆڵیوە. ناتوانیت بە ئاسانی ئەو شوێنە بەجێ بهێڵیت کە ئارەزووی مانەوە دەکەیت لێی. ناتوانیت کەسێک لە ناختدا بکوژیت کە لە خوێنتدا دەژی.

جودایی؛ گەر دوو کەس وەک یەک یەکدیان خۆشنەوێت، بێگومان ڕوودەدات. وە گەر یەکدیان خۆشبوێت مەحاڵە گەر یەکێکیان عاشق بێت و ئەوی دیکە عاشق نەبێت ژیانی عاشقەکە وێران دەبێت. تەنانەت باسکردنیشی سەختە. ڕۆیشتنی ئەو لە تۆ دەبێتە دەستپێکێکی نوێی ئازارکێشان بۆت. هەموو ئەو خۆشیانەی

لە ژیانتدا هەن دەبنە خەم و ئازار. گەر بە گڕی جودایی بسوتێیت هیچ ئاوێک ئاگرەکەت خامۆش ناکات.

زۆر سەختە قبوڵکردنی ئەوەی ئەو کەسەی ساڵانێکی تەمەنت پێبەخشیوە پشتت لێبکات و درۆت لەگەڵ بکات. هەموو ئەو کاتە خۆشانەی پێکەوە بەسەرتان بردووە بێنرخ بوون لە لای. ئەو چیدی گرنگی بە خەم و ژانی تۆ نادات و ڕۆیشت.

ئازارەکانت ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکەن. یادەوەرییەکان لە خەمدا بەندت دەکەن. هاوسەنگیت لە دەستداوە و بەرگەی هیچ ناگریت. دەتەوێت دووربکەویتەوە و لەبیری بکەیت. بەڵام هەنگاوەکانت ناتوانن زاڵبن بەسەر خۆشەویستیت و دورتبخەنەوە. بۆ هەر جێیەک بڕۆیت یادگاریەکانی لەگەڵت دێن. هەرچی بکەیت دڵت ناگەڕێتەوە لای خۆت، چونکە تۆ دڵت بە ئەو بەخشیوە. هێشتا گڕی ناخت دانەمرکاوەتەوە. هەموو ئەو هەوڵانەی داوتە بۆ لەیادکردنی ئەو بێهوودە بوون. بە تێپەڕبوونی کات بۆت دەردەکەوێت کە هێشتا لە جێی خۆتیت و هیچ بەرەوپێش نەچوویت، هیچ دوورنەکەوتویتەتەوە. هەموو هەوڵەکانت بێسوود بوون. نە توانیوتە لە یادی بکەیت نە توانیوتە بێیتەوە سەر خۆت.

وە ڕۆژێک بە تەواوی تەنیا دەبیت و هەست بەوە دەکەیت کات تێپەڕیوە و برینەکانت وەک خۆیان ماون. قبوڵی دەکەیت کە هەموو شتێکت بۆ ئەوەکرد بیری نەکەیت، بەڵام سەرکەوتوو نەبویت. قبوڵی دەکەیت هەرچەند ساردیش مامەڵە بکەیت، دڵت هەر گەرمە.

"لە یادی مەکە، لەبیرکردن کاری عاشقەکان نییە"

گەر خەمباریش بیت و توڕەش ببیت، مەبە بە هۆکاری دڵتەنگی هیچ کەسێک.
هەرچەند بتگریەنن، مەبە بە هۆکاری گریانی کەس. تۆ خۆتبە. چونکە ئەوەی بگری هەر باش دەبێتەوە، بەڵام وای بە حاڵی ئەوەی کەسێک دەگریەنێت!

## نەلەگەڵ تۆ، نەبەبێ تۆ...

خۆشمدەوێیت، بەڵام ڕقیشم لێتە. بەبێ تۆ ناژیم. نە دەتوانم چیدی لە دڵمدا جێگات بکەمەوە و نە دەتوانم لەبەرچاو خۆمت بخەم. تۆ چۆن گوناهێکیت بەهەموو جۆرێک بەهۆی تۆوە دەسوتێم. بە جۆرێکیت هەم چارەمیت، هەم بێچارەییم. هەم دەردمیت، هەم دەرمانم. هەم چاکم دەکەیتەوە و هەم دەمکوژیت. ئەم تەڵخییە دەمخنکێنێت. نە لەگەڵ تۆ دەمکرێت و نە بەبێ تۆ. نە دووریتم دەوێت و نە ئەوەشی کە لەلام بیت. نە دڵخۆشم دەکەیت و نە دەمگریەنیت. لە جەنگێکدام لە نێوان ئەقڵم و دڵم. بێهێزم، بێچەکم، هەست دەکەم بێ نیشتمانم. هەرکامێکیان ئەم جەنگە ببەنەوە، ئەقڵم یان دڵم، من هەر دۆڕاوم.

**"ئازارێکە هێندەی دونیا گەورەیە، بڕۆم دەیچێژم و بشمێنمەوە هەر دەیچێژم. وەک بیرێکی بێ بنە، بکەوم دەمرم، نەشکەوم هەر دەمرم"**

# خۆشی دەوێم؟
# خۆشی ناوێم؟

## خۆشی دەوێم یان خۆشی ناوێم؟

ئەمە ئەو پرسیارەیە کە هەموومان بەدوای وەڵامەکەی دەگەڕێین. لە ناخماندا دایم گومان و مەراق هەیە، لە ڕێگەی فاڵ و کارتەکانەوە دەمانەوێت وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەستبکەوێت. تەنانەت لە پەڕی گوڵە بەیبونەکانیش دەپرسین.

باشە، گەر دەتەوێت لە ڕاستی و دروستی ئەو کەسە بگەیت کە پێت دەڵێت عاشقتم، دەبێت بزانیت چەند لەوە دەترسێت لەدەستت بدات. چونکە ئەو کەسەی خۆشی دەوێت زۆر لەوە دەترسێت لەدەستت بدات. سەیر بکە بزانە چ ڕیسکێک دەکات لە پێناوت. چونکە ئەوەی عاشقی کەسێک بێت هەموو شتێک دەکات لەپێناوی. سەیر بکە بزانە لە پێناوت بەرگەی چی دەگرێت. مرۆڤ گەر کەسێکی خۆشبوێت هێندەی خۆشەویستییەکەی ئارام دەگرێت. سەیر بکە بزانە چەند خۆی دەکاتە خاوەنت. چونکە گەر کەسێک کەسێکی خۆشبوێت هەموو هەڵەکانی ڕابردووی ئەو

کەسە قبوڵ دەکات. بڕوانە بزانە چەندێک دروستە لەگەڵت. چونکە گەر کەسێک کەسێکی خۆشویست بە ئاسانی درۆی لەگەڵ ناکات.

لە یادی مەکەن؛ گەر ئەو کەسەی دەڵێت خۆشمدەوێیت دیاریت بۆ بهێنێت و دڵخۆشت بکات بەو مانایە نایەت بەڕاستی تۆی خۆشبوێت. دەکرێت ئەمانە لەبەر بەرژەوەندییەکانی خۆی بکات...

ئەگەر کەسێکتان خۆشدەوێت و خەیاڵ دەکەن لە داهاتوو لەگەڵی بن، دەبێت زۆر بە باشی بیناسن، بۆ ئەوەی لە داهاتوو خەمبار نەبن. ئاسانە کەسێک دەستت بگرێت، ئاسانە بڵێت خۆشم دەوێیت، بەڵام ئاسان نییە فیداکاریت بۆ بکات. ئاسانە گوڵت بۆ بکڕێت، ئاسانە بتبات بۆ ڕێستۆرانتێکی گرانبەها، بەڵام ئاسان نییە بتبات بۆلای خێزانەکەی. ئاسانە واز لە شتی بچووک بهێنێت، بەڵام ئاسان نییە واز لە غروری بهێنێت، تۆ بزانە ئەوە دەکات لە پێناوی تۆ.

لە یادت بێت؛ عەشق شتێکە بە پارە ناکڕدرێت. هەر کارێک بە پارە بکرێت قوربانیدان نییە لەپێناو عەشق...

**"دەبێت مرۆڤ تا کۆتا هەناسەی خۆشیبوێیت، نەوەک تا ئارەزووەکانی کۆتایی دێت، چونکە عەشق ناوەکییە، دەرەکی نییە"**

## کێ دۆڕا؟

دەڵێن عەشق واتە کردنی هەموو شتێک بۆ مەعشوق. لەبەر ئەم هۆیەش دەڵێن مەعشوق یان دەبێتە هۆکاری ژیان، یان دەبێتە هۆکاری مردنی عاشق.

فیداکاری بڵێین فیداکاریت کرد، لەخۆبەخشین بڵێین لە خۆت بەخشی، هەوڵ بڵێین هەوڵتدا. هەر بەڕاست بەهۆی خۆشەویستییەوە هەموو ئەمانەت نەکرد؟ هەرچیت پێکرا نەتکرد؟ تەنها لەبەر ئەوەی ئەو دڵخۆشبێت خۆتت خەمبار نەکرد؟ بەشی پێویست خۆتت بۆ ئەم عەشقە وێران نەکرد؟

کە نەبوو لەوە زیاتر خۆت ماندوو مەکە!

خۆت بە دۆڕاو مەزانە و بە خۆڕا ئازاری خۆت مەدە.

ئەو نە شایەنی تۆ بوو نە خۆشەویستییەکەت. ئەو بەرژەوەندیخواز و خائین نەبوو؟! تۆ دڵپاکیت. تۆ بەم دڵە پاکەتەوە دڵخۆش دەبیت و ئەویش بەو دڵە خراپەیەوە لەناودەچێت. هەردووکتان هەڵبژاردنی خۆتان کردووە. تۆ باشیت هەڵبژارد، ئەو خراپی. وازی لێ بێنە باشتر کە کۆتایی هات.

ئێستا بڵێ بزانم؛ تۆ دۆڕایت یان ئەو؟

## مەترسە، ناخنکێیت...

هەندێک جار ژیان زلەیەکی بەهێزت لێدەدات، دەتخاتە لەرزین. کە تۆ دەلەرزیت ئەو دەریای خەمەی لە ناختدایە شەپۆل لێدەدات. ئەو کەشتییەی ئومێدەکانت تێیدا هەڵگرتبوو نوقم دەبێت. بەپێی تێپەڕبوونی کات بێهێزدەبیت و خۆشت دەکەویتە نێو دەریاکە. بەڵام لەبەر ئەوەی بێچارەیت و کەوتوویتەتە ناو ئەو دەریایە نابێت دەست بۆ پوش ببەیت تا خۆت بگریتەوە.

لە یادی مەکە؛ ئەو دەریایەی تێیکەوتوویت هەرچەندیش قوڵ بێت، بە ویستی خودا ناخنکێیت. هەرچەند خەمەکانت بەرەو قوڵایت نوقم بکەن، گەر بەرگی سەبرت لەبەر کردبێت هەرگیز ناخنکێیت. ئاگاداربە لە تاقیکردنەوەدایت، بەبیرکردنەوە لە ڕابـردووت و ترسان لە داهاتووت بە هیچ ناگەیت. بەبێئومێدی و ڕەشبینی ناتوانیت بژیت.

خەم مەخۆ، خودا پشتی لێنەکردوویت. لە یادت کرد، چەند جار کۆڵتدا و خودا نوری ئومێدی نیشان دایت. چەند جار بێزاربوویت و خودا ڕێگای وازهێنانی لێگرتیت. چەند جار کەوتیت و خودا هۆکاری هەستانەوەی پێدایت. گەر خودا هێندە یارمەتی دابێت، گەر خودا هێندە تۆی پاراستبێت، واتە هێشتا چیرۆکی تۆ کۆتایی پێنەهاتووە...

## کەسێکی بێئومێد مەبە!

وامەزانە ژیان هەر خەم و ئازار و ناخۆشیت بۆ دەهێنێ. باوەڕم پێبکە ژیانت هەر بەم جۆرە بەردەوام نابێت.

لەو کاتەی کە چاوەڕوانیت، ژیان کەسێک دێنێتە سەر ڕێت فێرت دەکات چۆن عاشقبیتەوە، فێرت دەکات چۆن ئومێد لەدەست نەدەیت، فێرت دەکات چۆن جارێکی دیکە خەیاڵ بکەیت. فرمێسکی چاوت دەسڕێت و دڵخۆشت دەکات، سەرکەوتوودەبیت و دڵت فەتح دەکات.

تۆی بەبێ هیچ مەرج و بەرژەوەندییەک خۆشدەوێت. لە هەمووی گرنگتر متمانەت بەدەست دەهێنێت. دەبێتە هاوبەشی دەرد و خەمت، وە هەموو پارچە شکاوەکانت کۆدەکاتەوە. تۆ تەنها پشت بە کات ببەستە، چونکە کات تێدەپەڕێت و بێگومان ڕۆژێک هەموو ئەمانە ڕوودەدەن کە باسمکرد.

**"بە ئومێد بە! چونکە ئومێد هەرچەند زۆربێت ژیان هێندە بەنرختر دەبێت"**

## لێپرسینەوەی ژیان

### ماندووبوویت لە خەمخواردن؟

ئەگەر وایە، کەواتە دەبێت بۆ ئەوەی بزانیت چیت لەدەستداوە و چیت بردوەتەوە، وە بۆ ئەوەی ڕێگری لە پێشهاتە خراپەکان بگریت دەبێت لێپرسینەوە لە ژیانت بکەیت.

ئەگەر وا هەستدەکەیت ژیانت کەموکورتی تێدایە، وە ئەو شتانەی خەمبارت دەکەن زیادیان کردووە، وەک جاران چێژ لە ژیانکردن وەرناگریت، دەبێت تا زووە دادگایی خۆت بکەیت. دەبێت بێیتەوە سەرخۆت و گوێ بۆ خۆت ڕابگریت. دەبێت بڕوانیت بزانیت لە کوێدا هەڵەت کردووە و ئەو هەڵانە توشی چییان کردوویت، وە چاکیان بکەیتەوە و هەوڵ بدەیت بە شێوازێکی ڕێکوپێکتر مامەڵە بکەیت، تا ژیانت ڕێک بخەیتەوە.

خەمباریت، وە هۆکاری خەمبارییەکەت نازانیت؟

گەر وایە بەراوردی ئەو ژیانە بکە کە دەتەوێت تێیدا بژیت لەگەڵ ئەو ژیانەی ئێستا تێیدا دەژیت. گەر جیاوازییەکی گەورە هەبوو لەو نێوەندەدا، یان ئەوەیە خەیاڵەکانت زیاد لەپێویست گەورەن، یان بەهۆی کەسانی دەوروبەرتەوەیە. لە جیاتی ئەوەی دوای خەیاڵی زۆر گەورە بکەویت و کەسی بێسوود بهێنیتە

ژیانتەوە. هەوڵ بدە خەیاڵی نزیکتر لە ڕاستی بکەیت و کەسانێک بهێنیتە ژیانتەوە کە سوودیان بۆت هەبێت. بەم جۆرە زیاتر لە دڵخۆشی نزیک دەبیتەوە و ژیانت خۆشتر دەبێت.

لە یادی مەکە، گەر هاوسەنگی لەنێوان ژیانت و خەونەکانت ڕانەگریت بەردەوام خەم دەخۆیت و لە نێوان ئەو جیاوازییەدا ژیانت ونده‌کەیت.

## ویژدانم ئاسوودەیە!

دەزانیت بۆچی ویژدانم ئاسوودەیە؟
چونکە خستیانمە گریان، بەلام من کەسم نەگریاند.
چونکە خیانەتم لیکرا، بەلام خیانەتم لە کەس نەکرد.
هەلخەلەتینرام، بەلام کەسم نەخەلەتاند.
گەر باشییەکانمیان بە خراپە بەکارهێنابێت، هەرگیز وازم لە باشبوون نەهێناوە.
ئەوکاتەشی دۆڕاوم ئیرەییم بە کەس نەبردووە.
زۆر شەیتانم بینی، بەلام نەکەوتمە تەلەی کەسیانەوە.
خەمباربووم، پارچە پارچەبووم، بەلام هەرگیز پەشیمان نەبووم لە کردەوەکانی ڕابردووم...
ئەگەر من بتوانم شەوان بە ئاسوودەیی بنووم
ئەگەر من سەرتاپام ئارامی بێت
ئەگەر من بتوانم شانازی بکەم بە خۆمەوە
بەهۆی ئەوەیە کە ویژدانم ئاسوودەیە...

## خاڵی کۆتایی دابنێ...

خۆشویستنی کەسێک بەو واتایە نایەت هێندە گرنگی پێبدەیت هەموو هەڵەکانی قبوڵ بکەیت. یان ڕێگە بدەیت خەمبارت بکات و چاوەڕوانبیت ئاشتت بکاتەوە. لەبیرت بێت قبوڵکردنی هەڵەکانی کەسێک و بەردەوام لێخۆشبوونت وە سەرەڕای ئەوە بە جۆرێک مامەڵە بکات وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت عەشق نییە، ئەمە ئازاردانی خۆتە. تۆ چۆن شەرم دەکەیت دەنگت بەرز بکەیتەوە تەنها لەبەر ئەوەی خۆشتدەوێت، دەبێت ئەویش بەو جۆرە مامەڵەت لەگەڵ بکات کە شایەنیت. عەشق و خۆشەویستی ئەمەی دەوێت.

دەکرێت کەسێکت زۆر خۆشبوێت، دەکرێت بەرگەی هەڵە گەورەکانی بگریت. لەبەر خۆشەویستی و دڵخۆشی، دەکرێت چاو لە زۆر شت بپۆشیت و هەلی نوێی پێبدەیت. بەڵام ڕۆژێک دێت بێزاردەبیت و بەجۆرێک کۆتایی پێدەهێنیت خاڵی کۆتایی دادەنێیت و هەرگیز نزیکی ئەو کەسە ناکەویتەوە. ئەگەر ناتەوێت خەمباربیت، پێشنیاری ئەوەت بۆ دەکەم چاوەڕوانی کەسێک نەکەیت کە گوێبیستی قسەکانت نابێت و چاوی هەوڵەکانی تۆ نابینێت. هیچ کەسێک لە دڵتدا هەڵمەگرە کە گرنگیت پێنادات. گەر

تۆی بە هەموو جۆرێک قبوڵ بێت و خۆشی بوێیت لەلای بە، وە مەترسە، بەڵام گەر گومانی لە خۆشەویستییەکەی هەبوو یەک چرکەش لەلای مەوەستە.

**"گەر ناتەوێت کەسێک هەڵەت بەرامبەر بکات، دەبێت خاڵێکت بەدەستەوەبێت هەر کاتێ پێویستی کرد بەبێ ترس دایبنێیت"**

عەشق وێناکردنی جەستە نییە
وێنەکێشانی ڕۆحە.
عەشق کەلەپچەکردنی جەستە نییە
بەندکردنی دوو دڵە لەنێو یەکدیدا...

## ئەی ئەگەر داهاتووت باشتربێت
## جوان گوێم بۆ بگرە!

گەر پەیوەندییەک کۆتایی هاتبێت، واتە کۆتایی پێهاتووە. چیتر بەدوادا ڕۆیشتنت سودی نابێت. لە یادی مەکە؛ زۆرکردن لە عەشق تەنها ئازاری دڵت دەدات. ئیتر دەبێت فێرببیت هەر کە پێویستی کرد خەڵکی بسڕیتەوە و وازبهێنیت. هەڵە دەکەیت گەر پێتوابێت ئەو دێتەوە، چونکە ئەو ئیدی ڕۆیشتووە. ئەو نەخۆشی خستویت، تۆ هێشتا بە شیفای دەزانیت. ئەو دونیای لێکردوویت بە گۆڕستان، تۆ هێشتا نزای بۆ دەکەیت. مەکە! داوای گەڕانەوەی کەسێک مەکە ئازاری دابیت. ئیتر هەڵە بەرامبەر بە خۆت مەکە لەبەر کەسانی هەڵە. کاتێک خودا دڵخۆشی تۆی دەوێت تۆ بەقسەی شەیتان مەکە.

بۆچی لە خۆڕا خەمبار دەبیت؟ ئەگەر ئەو گرنگی بە ئازار و فرمێسک و خەمی تۆ نەدابێت، هەوڵی بۆ پەیوەندییەکە نەدابێت و شایەنی تۆ نەبووبێت دەبێت تۆش بەبێ هۆکار خۆتی بۆ خەمبار نەکەیت. لەمە زیاتر دڵت ماندوو مەکە، ئەمە کۆتایی دونیا نییە. چی دەبێت گەر ڕۆیشتبێت؟ کێ ناڵێت داهاتووت باشتر نابێت؟

**خەم مەخۆ، دڵیش وەرزی هەیە، ئەم زستانەش تێدەپەڕێت و بەهاری دڵت دێت، گوڵەکانی دڵی تۆش دەگەشێنەوە"**

## هەرکەسێک کە دێت تاکۆتایی خۆشیناوێت...

مرۆڤ لە هەموو کەس خۆشدەبێت، بەڵام تەنها لە خۆی خۆشنابێت. کاتێک هەڵە بەرامبەر بە کەسێک دەکەیت هەتا ئەو کەسە لێتخۆشدەبێت ئازار دەکێشیت. بەڵام کاتێک هەڵە بەرامبەر بە خۆت دەکەیت هەرگیز لە خۆت نابووریت.

مرۆڤ زۆر بە ئاسانی دەکەوێتەی هەڵەی عەشقەوە. ئەو ئارەزووەی هەیەتی بۆ دڵخۆشبوون توانای بیرکردنەوەی ناهێڵێت. ئەمەش وا دەکات هەڵە بکات. لەوانەیە هەست بە هەڵە بچووکەکان نەکات، بەڵام کاتێک هەڵە لەسەر هەڵە بەردەوامبوو ئاسەواری زۆر قوڵ لە ناخیدا بەجێدەهێڵێت. بۆ نموونە ڕۆژێک کەسێکت خۆشدەوێت، وە متمانەی پێدەکەیت، هەروەها وادەزانیت وەک خۆت وایە. ئەم سێ هەڵەیە هەموو متمانەی تۆ بە عەشق لەناو دەبات ، کاتێک هەست بەمە دەکەیت دەزانیت کە زۆر شتت لەدەست دەرچووە و زۆر دواکەوتوویت.

لەبەر ئەم هۆکارانە کەست زۆر خۆشنەوێت، ئەگەر خۆشیشت ویست زۆر متمانەی پێمەکە، گەر متمانەشت پێکرد وامەزانە وەک خۆت وایە. هەرچی دەکەیت بیکە بەس ئەم سێ هەڵەیە بەیەکەوە مەکە.

لە یادی مەکە! هەر کەسێک کە دێت تا کۆتایی نامێنێتەوە. ئەو کەسانەی کە پێت دەڵێن؛ "من بەردەوام لاتدەبم"، بەجۆرێک دەڕۆن تەنانەت ئاوڕیشت لێنایەنەوە. تۆ خۆتبە، بۆ ئەوەی هەڵە بەرامبەر بە خۆت نەکەیت کەس وەک خۆت مەبینە و متمانەی تەواوی پێمەکە.

ئێستا کە کاتت هەیە هەتا دەتوانیت پێبکەنە، هەتا دەتوانیت خۆشەویستی بکە، بیری بکە، هەتا دەتوانیت خۆش بژی. هەرچۆنێک بێت ڕۆژێک کەسێک دەناسیت کە هەموو ئەمانەت بیردەباتەوە.

## ئەگەر دەکرێت...

پێویست بە قەرەباڵغی زۆر ناکات، با کەسی کەمت لەدەوربێت، بەڵام کەسی ڕاست و دروستبن. ئەگەر دەکرێت با ئەو کەسانەی کە لەلاتن کەسانێک بن لە پێناوت بتوانن بجەنگن، با ئەو کەسانە نەبن کە دەتخەڵەتێنن و لە نیوەی ڕێگا بەجێت دەهێڵن.

کەسانێک لە دەورت کۆبکەرەوە جێی متمانەبن، چونکە هەموو کەس جێی متمانە نییە. ئەگەر دەکرێت با ئەو کەسانەی کە لەلاتن با کەسانێک بن بتوانێت نهێنییەکانتیان لەلا باسبکەیت. با کەسانێکبن لە پاشەملە باست نەکەن و لە یەکەم هەل کە بۆیان ڕێکدەکەوێت خیانەتت لێنەکەن.

مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە کەسی واقعیینە. گرنگ نییە جوانبێت، قۆزبێت، یان خاوەن کارێکی باشبێت. ئەگەر دەکرێت با کەسەکانی ژیانت واقعیبن. گرنگیت پێبدەن، نرخ و بەهات بزانن، وە بۆ هەمیشە لە پێناوت بجەنگن، نەک کەسانێکی کاتیی بن و بڕۆن.

پێشنیاری من بۆت ئەوەیە؛ بۆ هیچ کەسێک خۆت بچووک مەکەوە، وە هەرگیز هێندە گرنگی بە هیچ کەسێک مەدە بتوانێت چەندین جار خەمبارت بکات. شەرم مەکە لەوەی بۆ ئەو کەسانە

بجەنگیت کە شایەنین. هەرگیز نەکەیت فرمێسک بۆ ئەو کەسانە بڕژیت کە شایەنی نین.

لە یادی مەکە؛ تۆ هەرچەند نیازپاک و بەنرخ بیت ببە، گەر ئەو کەسەی لەگەڵتە وەک تۆ نەبوو ئەو تۆش دەهێنێتە خوارەوە و بێنرخت دەکات. لەبەر ئەم هۆکارە تۆ خۆتبە و ژیانە بە بەهاکەت بە کەسی بێبەها مەڕوخێنە.

## پێش تۆ؛ دوای تۆ...

ڕاستییەکەی من دوو کەسم ...
یەکێکیان شەوە و یەکێکیان ڕۆژ
یەکێکیان سپی و ئەوی دی ڕەش
یەکێکیان هی کاتی پێش تۆیە و ئەوی دی هی دوای تۆ.

من لەپێش تۆ، کەیفخۆش و دڵخۆشبووم، جێم بە خۆم نەدەگرت و هەردەم پێدەکەنیم. خەڵکیم خۆشدەویست و متمانەم پێیان دەکرد. باوەڕم بە چیرۆکەکان هەبوو، کەسێکی بە ئومێدبووم، کەسێک بووم خەیاڵی پاکم هەبوو. ڕێزم بۆ عەشق و عاشقەکان هەبوو. کاتێک کەسانێکم دەبینی یەکدیان خۆشدەویست دڵخۆشدەبووم، نزام دەکرد منیش بەو شێوەیە بژیم...

ڕۆژێک تۆم ناسی، ڕاهاتم لەگەڵت، تێکەڵتبووم و تۆم وەک خۆم دەبینی. تۆ وەک قارەمانی چیرۆکەکان بوویت. کە تۆم دەبینی وام هەستدەکرد لەسەر هەورێکی پەمەییم. پێم لە زەوی دەبڕا و بەرەو ئاسمان دەفڕیم، بەڵام بێخەبەربووم لەوەی دەکەومە خوارەوە.

ئێستا کە بیردەکەمەوە دەزانم ئەو کاتانە چەند بێ بەرگریی بووم. وەک کۆترێکی بێلانەبووم کە تازە لە هێلکەکەی هاتۆتە دەرەوە. هەیەجانم هەبوو، شەرمن بووم، دەترسام. ڕاستییەکەی وامدەزانی تۆش وەک منیت. متمانەم پێکردیت. تۆم وەک دایکم خۆشویست.

وامدەزانی لەگەڵ تۆ چیرۆکی خۆمان دەنووسینەوە و دەژین. وامزانی لەگەڵ تۆ دونیایەکی نوێ بۆ خۆمان دروستدەکەین و شاری خۆمان دەبێت. لە لم قەڵامان دروستدەکرد. داری سێومان دەبوو و تا کۆتایی بەم جۆرە دەژیاین. تۆ ئەوەت هەڵنەبژارد. تۆ ئەوەت هەڵبژارد دڵم بریندار بکەیت و ببیتە قەڵەمێک ڕەشم بکەیت. لە جیاتی ئەوەی قۆڵەکانتم بۆ بکەیتەوە پشتت لێکردم و هەڵهاتیت. من بە هەموو بەرائەتی خۆمەوە خۆشم ویستیت. تۆ ئەمەت بۆ بەرژەوەندی خۆت بەکارهێنا. من هەموو شتێکم بە تۆ بەخشی. بەڵام تۆ ئومێد و باوەڕ و متمانە و خەیاڵەکانمت برد، بە کورتی هەموو شتێکی منت برد. سەرەڕای هەموو شتێک چاوەڕێم کردیت. تۆش هەر نەهاتیت. دەزانیت لە هەمووی بە ئازارتر چییە؟ نە دڵم نە جەستەم توانای ئەمانەی هەبوو، نە تۆش بەلاتەوە گرنگ بوو.

من دوای تۆ؛ بوومە کەسێکی بێزار، بێهەوەس، بەستوو. بوومە کەسێک کە هیچ پێناکەنێت. بوومە کەسێک کە کەسی خۆشناوێت. بوومە کەسێک باوەڕم بە چیرۆک و ئەفسانەکان نەما. بوومە کەسێک خەیاڵم نەما.

چەندین بەڵێنم دا بە خۆم، بەڵام هیچیانم نەبردە سەر. پێکەنین و خەیاڵکردنم بیرچووەوە، تەنانەت خۆشمم لە یادکرد. بەڵام هەرگیز نەمتوانی تۆ لەبیرکەم. باوەڕم هێنا کە چیرۆکەکان درۆن. ئیدی بڕوام وایە خەڵکی تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆیان لێم نزیک دەبنەوە و عەشق تەنها پوچگەراییە.

وەک گوتم؛ من وەک کۆترێک بووم کە تازە لە هێلکەکەی هاتۆتە دەرەوە. تۆش کەسێکی چاو لەدەربوویت، ڕێک وەک ڕاوچییەک بوویت. بەبێ ئەوەی هیچ بیرێک بکەیتەوە باڵەکانمت شکاند. دەزانیت دوای تۆ من هیچ نەمتوانی بفڕمەوە؟!

## هێڵێکی باریک...

کاتێک سەیری ڕابردووم دەکەم، دەبینم ژیانم پڕە لە هەندێک ڕووداو کە هەرگیز نەدەبوو تێیدا بژیم. وە لە سەردێڕی زۆربەی ئەو ڕووداوانەدا تۆ هەیت. کاتێک دەبینم ژیانم بە هەدەر داوە، هەست بەوەش دەکەم کە کاتێکی زۆر کەمم ماوە بۆ ئەوەی ئەو شتانە بژیم کە دەمەوێت. دەزانم دەبێت تۆ لە دڵم بکەمە دەرەوە و ژیانم ڕێک بخەمەوە و لە سفرەوە دەستپێبکەمەوە، بەڵام نازانم دەتوانم تا کوێ بڕۆم بەو جۆرە...

هیچیترم نەماوە بۆ تۆ فیدای کەم. دەمەوێت لەم کابوسە بەخەبەربێم و ئەو کاتانە بەدەست بهێنمەوە کە لەدەستم داوە لەگەڵ تۆ، دەمەوێت سەر لە نوێ دەستپێبکەمەوە. دەمەوێت لەبری ئەوەی لە خەیاڵدا بژیم و سەیری کەسە دڵخۆشەکان بکەم، خۆم بە دڵخۆشی بژیم. دەمەوێت لەگەڵ خۆم ئاشتببمەوە و ئەو شتانە بژیم کە بەهۆی تووە هەرگیز نەمتوانیوە تێیدا بژیم.

داواکارم لە الله ژیانێکی ئارام و خۆشم پێببەخشێت بەبێ بوونی زەڕڕەیەک لە یادی تۆ...

بەڵام دەزانم ئەمە هیچ ئاسان نییە. چونکە هێڵێکی باریک هەیە، ئێستا گەر تۆ لەبیر بکەم، دەبێتە بێڕێزی بەرامبەر بەو خۆشەویستییەی بۆ تۆم هەبووە. گەر بەردەوامبم لە خۆشویستنت، دەبێتە ناهەقی بەرامبەر بە دڵم، هەر کامێکیان هەڵبژێرم ڕابردوو ڕاببردووە... لە هەمووی باشتر ئەوەیە وەک ئەوە بژیم کە تۆ هەر نەبوویت.

## تۆ توانیت بڕۆیت؟

### ماندوویت....

چونکە دەتەوێت بەردەوامی بەوە بدەیت کە ئەو کۆتایی پێهێناوە. چونکە تۆ خەریکیت ئەو بارە هەڵدەگریت کە ئەو لەسەر شانت بەجێیهێشتووە. ئەو دەمێکە تۆی لە یادکردووە. بەڵام تۆ هێشتا ناتەوێت لە یادی بکەیت. ئەو پشتی لێکردوویت و تۆش باوەشت بۆ کردوەتەوە و چاوەڕوانی دەکەیت. ڕاستییەکان لە پێشچاوتن و تۆ هێشتا خۆت لە گێلی دەدەیت. تۆ هێشتا بیری لێدەکەیتەوە و هەڵە دەکەیت.

توانیت لە دونیای خەیاڵ دەربچیت و ڕووبەڕووی ڕاستییەکان بیتەوە؟

توانیت بڕۆیت؟ توانیت لەبیری بکەیت؟ توانیت پشتی لێبکەیت؟

باشە بۆ نەتکرد؟ چونکە خۆشتدەویست. ئەی ئەو بۆ وایکرد؟ چونکە تۆی خۆشنەدەویست! گەر سەختیش بێت دەبێت ڕاستییەکان قبوڵ بکەیت. ئیتر وازبێنە لەوەی بیر لە ڕابردووت بکەیتەوە. لەوە زیاتر خۆت ماندوو مەکە. کات بە شتانێک بەسەر مەبە کە نابنە ڕاستی. ببینە ئیتر هەموو شتێک ڕوونە!

**"لە یادی مەکە، گەر ببیتە ئەسیری خەیاڵەکانت ڕاستییەکانت لەدەست دەچێت و لە ژیان دوادەکەویت"**

## نەکەیت بڕوخێیت...

ژیان وەک ڕەشەبایەکی بەهێز وایە. ئەو شتانەی تێیدا دەژیت دەیانەوێت بتڕوخێنن و تۆش هەوڵ دەدەیت لەسەر پێیەکانت بوەستیت. ئەگەر هەرزوو کۆڵبدەیت و وازبهێنیت زوو دەڕوخێیت. هەرگیز مەوەستە، بڕیار بدە و بەردەوامبە لە ڕێگاکەت، نەکەیت بوەستیت، چونکە زەوی بەردەوام دەخولێتەوە. هەوڵی خۆت بدە و هەرگیز کۆڵمەدە. چونکە بە وازهێنانی تۆ خراپەکاران واز لە خراپبوون ناهێنن و ژیان چاکنابێتەوە.

گەر کەسێک لەگەڵت خراپبوو واز لە کەسانی دیکە مەهێنە. هەرچەند ڕێگات لە کەسی خراپ هەڵکەوتبێت مەڕوخێ، دونیا هێندەش خراپ نییە. هێشتا کەسانێک هەن لە دونیادا هەوڵ بۆ دڵخۆشکردنی کەسانی دیکە دەدەن و دەیانەوێت بیانخەنە پێکەنین. نەکەیت بڕوخێیت! سەیرکە زۆر کەمی ماوە، کەسێکی وا دێتە بەردەمت، هەموو ئەو زوڵمانە لە یاد دەکەیت کە بەرامبەرت کراوە. ئارام بگرە، لە ماوەیەکی کەمدا تۆش دڵخۆشدەبیت.

”هەرگیز نەڕوخێیت!
چونکە ئەو کەسانەی
کە دەیانەوێت بتڕوخێنن
ڕۆژێک ملکەچت دەبن“

## عەشق...

عەشق نە دڵخۆشبوونە، نە دڵخۆشکردن. هەموو کەس حەز بە دڵخۆشبوون دەکات. عەشق واتە هەم دڵخۆشکردن، هەم لە کۆڵگرتنی خەمەکان ...

عەشق واتە ڕاستگۆیی لەگەڵ مەعشوق، بوونە جێی متمانە و بەخشینی سۆز و میهرەبانی بە ئەو. عەشق واتە شەرمکردن لەوەی دەستی لێبدەیت. عەشق بۆ هەندێک کەس لە پەڕی چۆلەکە سوکترە و بۆ هەندێکیش هێندەی زەوی قورسە ...

عەشق واتە سووتان و بەبێدەنگی بەرگە گرتنی. لەوانەیە خامۆش ببێت و لەوانەشە نەبێت. دەبێت بە ئارامییەوە چاوەڕوان بیت.

عەشق واتە ونبوون و تەسلیمبوون بەو کەسەی کە دەتدۆزێتەوە.. هیچ کەسێک ئارەزووی ئەوە ناکات کەسێکی خۆشبوێت کە لە خۆی دڵی بچووکترە. عەشق واتە هەڵگرتنی دڵی کەسێکی دیکە. عەشق پەیوەندییەکی هێندە بەهێزە هیچ کەسێک هێزی ئەوەی نییە تێکیبدات. بۆ دوو کەس کە یەکدیان خۆشبوێت

بەتەنیابوونیان هێندەی دونیا قەرەباڵغە. ڕەگی عەشق هێندە قوڵە هیچ کەسێک ناتوانێت دەریبهێنێت.

لە عەشقدا ئەگەر خۆشبویستریێیت نیوەی دڵت زیندوو دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر خۆشنەویستریێیت دەبێتە برین بۆ سەر دڵت. ژیان هیچ کەسێک تەنیا ناکات. گەر عاشقی کەسێک بیت یان تەواوت دەکات یان دەبێتە تەواوکەرت.

دڵ لە دونیا فراوانترە، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی عاشقن تەنها جێگای یەک کەسە.

## "ئێمە نازانین، ژیان پڕە لە سوپرایز"

## ئەو شتانەی تێیدا دەژیت شتانی ئاسان نین...

دەزانم شکاویت و خەمباریت، تەنانەت هیچ ئومێدێکیشت نەماوە. دەزانم وا بیردەکەیتەوە کە هیچ شتێک چاک نابێتەوە و بێئومێدی سەرتاپای گرتویت. ئەو شتانەی تێیدا ژیایت هەرچەند قورسە با قورس بێت، هەرچەند بارگرانی لەسەر دڵیشت بێت بەردەوامبە لە نزاکردن و ئارامگرتن. لە یادی مەکە خودا باشترینت بۆ هەڵدەبژێرێت و هەر خۆی زانایە. لە یادت بێت سەرەتای ئارامگرتن سەختە، بەڵام کۆتاییەکەی هەردەم خێردارە.

ئارامبگرە! وەک چۆن ئاوی سەرزەوی دەبێتە هەڵم، وە لە ئاسمان چڕدەبێتەوە و دەبارێتەوە، نزاکانی تۆش بە هەمان شێوەن. ڕۆژێک دێت نزاکانت بەسەرتدا دەبارێن، وە ئەو ڕۆژە تۆ لە هەموو ئازارەکانت پاکدەبیتەوە. بۆ هەر کوێیەک دەڕۆیت برۆ، بەڵام هەر دێیتەوە سەر خۆت. خەم مەخۆ، لە عەشقدا چیت دۆڕاندبێت بەدەستی دەهێنیتەوە. ڕۆژێک بێگومان ئەو عەشقە

دەدۆزیتەوە کە چاوەڕوان بوویت. ئەو دەبێتە هی تۆ، بە تەنها هی تۆ و بە تەنها سەیری تۆ دەکات و تۆی خۆشدەوێت. ئەو ڕۆژە دێت و تۆش سوپاسگوزاردەبیت کە پێشوتر خەمت خواردووە و شکاویت. ئارامبگرە! ژیان پڕە لە سوپرایز، ئێمە نازانین.

## ژنەکان بۆچی دەدۆڕێن؟
## با بۆتان باس بکەم بۆچی دەدۆڕێن...

### بە خێرایی متمانە دەکەن

گەورەترین هەڵەتان ئەمەیە؛ وادەزانن کەسی بەرامبەریش وەک ئێوەیە پەیوەستە بە عەشق و خۆشەویستییەوە. بەبێ ئەوەی بە جوانی بیربکەنەوە دڵ و هەستی خۆتان تەسلیمیان دەکەن. هەرزوو باوەڕ بە قسەکانیان دەکەن و قبوڵیان دەکەن. بۆیە کە ڕێتان لە کەسێکی خراپ دەکەوێت هەمیشە ئێوە خەمباردەبن.

### زۆر هەستیارن

زیاد لە پێویست گرنگی بە عەشق دەدەن، ناتوانن بە تەواوی کۆنترۆڵی ئەو هەستانە بکەن کە کۆتانکردۆتەوە. زیاد لە پێویست گرنگی بە کەسی بەرامبەر دەدەن و زۆریش ئەمە دەردەبڕن. بەپێی تێپەڕبوونی کات کەسی بەرامبەر بە خراپە بەکارتان دەهێنێت. وە ئێوەش بەهۆی هەستەکانتانەوە دەدۆڕێن.

## زۆر بەسۆزن

هەموو ژنێک هەستێکی دایکایەتی لە دڵیدایە کە بۆ منداڵەکانی دەردەبڕێت. بەڵام هەندێک ژن ئەمە بۆ ئەو پیاوانەش دەردەبڕن کە خۆشیان دەوێت، ئەمە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە! گەر پیاوێک بزانێت هەرچی بکات تۆ لێیخۆش دەبیت ئیدی فێردەبێت بە ئازادی بژی. ئەمەش بەپێی کات تۆ خەمبارتر دەکات و زیاتر ئازار دەکێشیت.

## کێشەی تەمەن

زۆر بیر لە تەمەنەکەتان دەکەنەوە. خەم لەوە دەخۆن تەمەنتان زوو تێپەڕبێت. ئەمەش واتان لێدەکات قبوڵی هەموو هەڵەیەک بکەن کە بەرامبەرتان دەکرێت. زۆر بیر لە تەمەنتان مەکەنەوە ئەگەر ئەو کەسەی لە ژیانتانە پیاوبێت هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە.

## زیاد لە پێویست خۆتان پەیوەست دەکەن

زوو پەیوەست دەبن، بەڵام زۆر بە سەختی وازدەهێنن. گەورەترین کێشەتان ئەمەیە. ئەگەر لەسەر حەقیش بن هەمیشە ئێوە یەکەم هەنگاو دەنێن. هەمیشە ئەوان تێکی دەدەن و ئێوە چاکی دەکەنەوە. وادەزانن چی لە دڵی ئێوەدایە لە دڵی ئەوانیشدایە. لەبەر ئەوەی خۆشتان دەوێن هەموو شتێک قبوڵ دەکەن. لە یادی مەکەن ئەو کەسەی هێندە گرنگی پێدەدەن ڕۆژێک لە یادتان دەکات.

## پێشنیارم بۆ ئێوە

زیاد لە پێویست فیداکاری بۆ کەس مەکەن، ئەوان چەند گرنگیتان پێدەدەن ئێوەش ئەوەندە گرنگیان پێبدەن. هێندە بەسۆز مەبن بەرامبەر بەو کەسانەی هەڵەتان بەرامبەر دەکەن. هەرچەند کەسێکتان خۆشدەوێت خۆشتانبوێت، بەڵام زیاد لە پێویست متمانەیان پێمەکەن، گەر نا هەر ئێوە خەمبار دەبن.

## مرۆڤ دەتوانێت چەند جار بمرێت؟

لەو کاتەوەی کە بەجێت هێشتووم من هەر لەو شوێنەم کە لێی ڕۆیشتوویت، هەرچی دەکەم ناتوانم بڕۆم. هەموو ڕۆژێکم وەک یەکە. هەموو بەیانییەک و ئێوارەیەکم وەک یەکە. لەوانەیە کاتێک بەیانیان چاو دەکەمەوە تۆ لە لای ڕاستم نەبیت، بەڵام ئەوە بزانە هەرگیز لەلای چەپ و دڵم ناڕۆیت. هەموو شتێکم بە یادگاری تۆ پڕە، ئەو کراسەی لەبەری دەکەم، ئەو کانییەی ئاوی لێدەخۆم، تەنانەت ئەو کەل و پەلانەشی کە لە باپیرانمەوە بۆم ماوەتەوە. وەک بڵێیت هەموو شتێک کە دەیبینم و گوێم لێدەبێت تۆی تێدایە. هەموو ڕەنگ و هەموو دەنگ و تەنانەت هەناسەکانیشم پڕن لە تۆ. ئەمەی کە لە هەموو جێیەکیت و لە هیچ جێیەکیش نیت منی لە ناوبردووە. لەگەڵ تۆ، هێندە تۆم خۆشویستووە و لەگەڵت ڕاهاتووم وەک مردووم لێهاتووە. دەزانیت ناتوانم دەست لە هیچ یادگارییەکت بدەم. من هیچ سەرکەوتوونەبووم لەوەی تۆ لە یاد بکەم...

کە لە ماڵ دەردەچم بە سەر شەقامەکاندا ڕەت دەبم، بۆنت هەر بەسەر شەقامەکانەوەیە. لە نێو ملیۆنان کەس هەر بۆنت دەکەم. لەسەر هەر شۆستەیەک، لە بەردەم هەموو جێیەک تۆ

هەیت. هەموو جێیەک وەک تۆ بۆنی گوڵی لێدێ. کە بۆنت دەکەم هەستدەکەم دڵم دێتە دەرەوە. کە بە خێرایی هەناسە دەدەم لەبەر ئەوە نییە کە ماندووم، لەبەر ئەوەیە بۆنت دێتەوە بەر لوتم.

سەیری ئەو منداڵانە دەکەم کە لە پارک یاری دەکەن، پێکەنینەکانی تۆم دەهێننەوە یاد. هەموویان شەرمن و پاکن. چەند شیرینن، چەند جوانن، ڕێک وەک تۆ ..دڵم دەردێت...

دەکرا هەردووکمان هەمان هەیەجانمان هەبێت لەگەڵ تۆ. دەکرا وەک ئەو منداڵانە دڵخۆشبین. کە ئەمانە دەبینم و دەزانم ناتوانین تێیدابژین هەستدەکەم بێچارەترین کەسی دونیام.

بەردەوامم لە ڕۆیشتن. تێپەڕین بەم ڕێگایەدا وەک ئەوەیە لەگەڵ تۆ پیاسە بکەم. وەک بڵێی هەموو چرکەیەک لەگەڵ تۆدام. وەک بڵێی هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵتدا دەژیمەوە. ئەم ڕێگایە و ئەم دەریایە لە چاوت دەچێت. بە قوڵی دەڕوانم و ئاوات دەخوازم لە لام بوویتایە. هەندێک جار شەوان دێم لەم دەریایە دەڕوانم کە لە قژەکانت دەچێت. بیرتە زۆر ئارەزووم دەکرد کاتێک دەنوستیت لێت بڕوانم؟

هەندێک جاریش دەڵێم بڕۆمە نێو دەریاکە. دەست لە خۆم بەربدەم و ونببم و کەس نەمدۆزێتەوە ... بەڵام ناتوانم! چونکە تۆ لە دڵمدایت. کە تۆ هەبیت چۆن دەستم بچێتە گیانی خۆم؟

کات تێدەپەڕێت. کە شەو و ڕۆژ تێدەپەڕن ئازارەکان زیاتر دەکەن. وەک ڕۆشنایی سەر شەقامەکان کە وندەبێت جێگات زۆر دیارە. کە تاریکی زیاد دەکات زیاتر هەست بە تەنیایی دەکەم. نە

جێگایەک هەیە بۆی بڕۆم، نە جێگایەک هەیە لێی ونببم، دڵم نا ئارامە، بۆ هەر جێگایەک بڕۆم هەر بێتۆم.

هێواش هێواش شەو بەسەرمدا دادەڕمێت. وێرانم دەکات هەتا پارچە پارچە دەبم. چۆن بۆت باسبکەم. وەک بڵێیت گوناهێکی گەورەم کردبێت. هەموو دونیا لۆمەم دەکات. دەڵێیت باری هەموو دونیا لە سەر شانی منە. هەر چرکەیەک کە تێدەپەڕێت من زیاتر بیرت دەکەم. نە بەرگەی ئاگری ناو ناخم دەگرم، نە دەتوانم لە گیانم ڕزگارم ببێت. خودایە ڕۆژ ببێتەوە و ڕزگارم ببێت.

دەکرێت مرۆڤ هەستەکانی ئازاری بدەن؟ دەکرێت خۆشەویستی هێندە خراپ بێت؟ مرۆڤ دەتوانێت لە شەوێکدا چەند جار بمرێت؟ هەموو ئەمانە زۆر نییە بۆ کەسێک؟

بە کورتی، من هەموو ڕۆژێک لە نێوان مردن و ژیاندام. هەموو شەوێک خەیاڵی ئەو شتانە دەکەم کە نەمانتوانی تێیدا بژین. کە ڕۆژیش دەبێتەوە خەیاڵی ئەو یادگاریانە دەکەم کە تێیدا دەژیاین.

**”چۆن دڵم ئازاری نابێت؟ من کە غیرەم لە خۆشم دەکرد ئێستا لەگەڵ هەموو دونیا بەشم کردوویت“**

دەبێت تەنها بۆ خراپەکاری بچیت بۆلای؟
بۆ نەخۆشی بچۆ بۆ لای.
بۆ خەمێکی بچۆ بۆ لای.
کە بیرتکرد بچۆ بۆلای.

شەرتە دەستی لێبدەیت؟
چاویت خۆشبوێت بەسە.
قژەکانیت خۆشبوێت.
ڕۆحیت خۆشبوێت.

## گەر دەبێت بە یارم وەرە،
## گەر دەبێت بە دەردم مەیە...

من بۆ ئەوەی ڕۆژانێکی خۆش بژیم زۆر ڕۆژی ناخۆش ژیام، بۆ ئەوەی ژیانم ڕوونبێتەوە زۆر بە تاریکیدا تێپەڕیم. ئازاری زۆرم چەشت بەهۆی ئەو کەسانەی کە متمانەم پێکردبوون. فێربووم چۆن بەو ئازارەوە بژیم. من بۆ دڵۆپێک ئارامی دەریایەکم وشک کرد. بۆ ئەوەی تەنها جارێک پێبکەنم زۆر ئاگرم کوژاندەوە. بۆ ئەوەی بەیانییەکی جوان ببینم زۆر شەوم ڕۆژکردەوە. ڕۆژانێک ژیام هێندە سەختبوون ناوی خۆمم لە یاد کردبوو.

دەمەویت ئەوە بڵێم؛ من ڕۆژانی سەختم زۆر بەڕێکرد، چیدی نامەوێت بخەڵەتێنرێم، نامەوێت لە هەوڵی دڵخۆشکردنی کەسێکدا بگریم، نامەوێت کاتێک هەوڵ بۆ کەسێک دەدەم بریندار بکرێم. نامەوێت جارێکی دیکە هەلم بە کەسێک دا بمباتەوە سەر خاڵی سفر. نامەوێت خیانەتم لێبکرێتەوە، چونکە هێزی بەرگەگرتنی خیانەتێکی دیکەم نەماوە. جەستەم بەرگەی برینێکی دیکە ناگرێت. هەر بۆیە دەڵێم گەر دەبێت بە یارم وەرە، گەر دەبێت بە دەردم مەیە.

”كەسانێكی زۆر بوون بە دەرس بۆم.
ئەم جارە زۆر باش دەرسم خوێندووە،
گەر سەركەوتوش نەبم لام گرنگ نییە،
من ئیتر بە نوشوستی ڕاهاتووم“

## دەکرێت کەسێک لەبیربکرێت؟ کەس لەیاد دەکرێت؟

دەتوانین کەسێک لەبیر بکەین و هەموو ئەو شتانەی ئەو دەیکات لە یادی بکەین؟ دەتوانین سەر لە نوێ دەست بە ژیان بکەین؟

بێگومان دەتوانین! بێگومان دەتوانین سەر لە نوێ دەست بە ژیان بکەینەوە. مرۆڤ گەر بیەوێت هیچ شتێک نییە نەتوانێت تێیدا سەرکەوتووبێت. تەنها ئەوە بەسە متمانەت بە خۆت هەبێت. تەنها ئەوە بەسە قبوڵی ڕاستییەکان بکات، تەنها ئەوە بەسە بزانێت دەبێت لە کوێوە دەست پێبکاتەوە.

ئەو گۆڕانکارییانەی لە هەستەکانماندا ڕوودەدەن دەبنە هۆی برین لە دڵماندا. ئەو جودایی و کێشانەی تێیدا دەژین، ئەو خەیاڵانەی کە نابنە ڕاستی دەکرێت لە داهاتوو ساردمان بکەنەوە. درۆی ئەو کەسانەی کە خۆشمان دەوێن و گرنگیان پێدەدەین دەبنە هۆی ئەوەی لە ناسینی خەڵکی نوێ و متمانەکردن پێیان بترسین. بۆ ئەوەی خۆمان لەم جۆرە زیان و ئازارانە بپارێزین دەبێت هەندێک ڕێگری دروست بکەین.

بۆ نموونە؛ دەبێت ڕێگربین لەوەی ژیانمان تێکبچێت دوای ئەوەی پەیوەندییەکەمان کۆتایی هات. کاتێک کەسێک ئازارت دەدات نابێت بە ڕاکردن لێی لە یادی بکەیت. نابێت خۆت تەنیا بکەیت و خۆت لە ژین سارد بکەیتەوە. دڵخۆشی لە داهاتوودا چاوەڕێت دەکات، تۆ نابێت چاوەڕوانی خەم بیت. تۆ بەهێزنیت؟ گوێی مەدەرێ، ناچارنیت هەمیشە بەهێزبیت. بێگومان ئازار دەکێشیت و خەم دەخۆیت. بێگومان فرمێسک دەڕێژیت بۆ ئەو کەسانەی کە لە دەستیان دەدەیت. بەڵام دەبێت باوەڕ بەوە بکەیت کە بەدەم گریان و خەم خواردنەوە دەتوانیت ئەو کەسانەش لە بیر بکەیت کە ئازاریان داویت.

زۆر گرنگە بزانیت چیت دەوێت! هەر بۆیە دەبێت بڕیارێک بدەیت. تۆ دەتەوێت ئەو لە یاد بکەیت یاخود کردەوەکانی؟ گەر دەتەوێت ئەو لە یاد بکەیت لە ڕێگایەکی هەڵەدایت. دەبێت سەرەتا کردەوەکانی ئەو لە یاد بکەیت. چونکە مرۆڤەکان خۆیان کاتیین، بەڵام کردەوەکانیان هەر دەمێنێتەوە. مرۆڤ هەمیشە ئەو شتانەی لە یاد دەمێنێت کە بەرامبەری کراوە. بۆ ئەوەی ئەو شتانە لە یاد بکەیت کە بەرامبەرت کردوویەتی دەبێت سەرەتا متمانەت بەخۆت هەبێت. نابێت مێشکت بە کەسێکەوە سەرقاڵ بکەیت کە شایەنی دڵت نییە. کە متمانەت بە خۆت کرد ئەوت بە لاوە گرنگ نامێنێت و دەتوانیت ئەو لە بیر بکەیت و بەرەو ڕێگایەکی نوێ بەڕێ بکەویت. دەبێت ئەم جارە دڵت باوەڕ بکات دەتوانیت سەربکەویت.

دواتر دەبێت باوەڕ و ئومێدەکانت جارێکی دیکە بەدەست

بهێنیتەوە. دەبێت باوەڕ بهێنیت کە ژیان تەنها خراپە و خراپەکارانی تێدا نییە. دونیا کەسی ڕاستگۆشی تێدایە و دەبێت باوەڕت هەبێت کە هەر ڕۆژێک بێت تۆش کەسێکی بەو جۆرە دەناسیت. ئەم شتانەی کە بەسەرت هاتووە تەنها بەسەر تۆ نەهاتووە کەسانێکی زۆر لە ڕووداوی بەم جۆرەدا ژیاون. دەبێت باوەڕ بەوە بهێنیت کە ئەم کەسانەش هەموو کەسی باشن و ڕاستگۆن، وە هەر ڕۆژێک بێت دێنە سەر ڕێی تۆش و یەکدی دەناسن. تۆش هیچ شتێکت کەم نییە لەم کەسانە کە وەک تۆ بوون و هەموو ڕابردوویان لە یادکردووە. تۆش دەتوانیت ڕووداوەکانی ڕابردوو لە یاد بکەیت. خودا ئەم هەلە بە تۆش دەدات.

هەرچی ڕووبدات خۆت تاوانبار مەکە. تۆ تاوانبار نیت! هەرگیز خۆت بە هۆکاری ئەو خەم و ئازارانە مەزانە کە بەهۆی پەیوەندییەکەوە توشتبوون. دەکرێت لە داهاتوودا هەموو ئەم خەمانە ببنە هۆکارێک بۆ دڵخۆشبوونت. ئەم تاقیکردنەوانە تێدەپەڕن و سەردەکەویت.

دەبێت باوەڕ بەوە بکەیت کە سەردەکەویت. نابێت هەرگیز ڕەشبین بیت. چونکە گەر ڕەشبین بیت هەر لە جێگای خۆت دەمێنیتەوە. ئەگەر سوربیت لەسەر بڕیارەکەت هەر ڕۆژێک بێت سەرکەوتوو دەبیت. تەنها بە نەرێنی بیرمەکەوە. بەردەوامبە لە هەوڵدان.

هەرگیز ئەمە لە یاد مەکە؛ ئەو کەسانەی کە بەردەوام هەوڵیان داوە و ئارامییان گرتووە، لە کۆتاییدا هەر سەرکەوتووبوون و بە

ئەنجامێکی خێردار گەیشتوون.

ئێستا ئەم پرسیارانە لە خۆت بکە؛ تۆ شایەنی ئەویت؟ یان شایەنی زۆر کەسی لەو باشتریت؟ دەبێت بگریت یان فرمێسک بڕێژیت؟ شایەنی ئەوەیت ئەم هەموو خەمە بخۆیت یان نا؟ هەموو ئەمانە بە دڵ وەڵام بدەوە. گەر سەختیش بێت دان بە ڕاستییەکاندا بنێ. ئەوە لە مێشکت بچەسپێنە کە دەتوانیت بەبێ ئەویش دڵخۆش بیت و لەیادیشی بکەیت، وە هەر ڕۆژێک بێت ئەم ئازارانە کۆتاییان دێت.

## عەشق واتە مردن...

دەبێت بزانیت عەشق واتە مردن. واتە تەسلیمبوون بە ئەجەلی خۆشەویستەکەت. عەشق واتە مردنی دڵت لە سینەتدا. ڕۆژێک کەسێک دێت و دەتژیەنێتەوە. خونچە دەکەیتەوە و گوڵدەگریت و بەهات بۆ دەهێنێت. گرنگیت پێدەدات و خۆشیدەوێیت، بۆنت دەکات و دەبێتە خاوەنت. بەرزت دەکاتەوە بۆ ئاسمان، وادەزانیت هەرگیز ڕێگا نادات بمریت. بەڵام ڕۆژێک دێت ئەو گوڵانەی وەک چاوت ئاگات لێیانبووە هەڵدەوەرن و بەدەستی ئەو کەسەی خۆشتویستووە لێدەکرێنەوە. بێچارە دەبیت و لە سەیرکردن زیاتر هیچت بۆ نامێنێتەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ بچووک دەبیتەوە .. کەم دەبیتەوە..

کاتێک تۆ بە بەردەوامی دەمریت، ئەو کەسەی کە ژیانی پێدابوو دەڕوات و بە تەواوی پێت لەسەر دادەنێت و هەموو یادگارییەکان بۆ تۆ جێدەهێڵێت.

دواتر دەچیتەوە قەبر.

بەڵام دواتر کەسێکی دیکە دێت، ئەو تۆ لەو قەبرە ڕزگار دەکات. ژیانت پێدەبەخشێتەوە، وە پێت دەڵێت زۆر باشە کە

نەمردوویت. دواتر ئەو دەتکوژێت، هیچ کەسێک گرنگی بە گیان و بە خۆشەویستیت نادات. هەموو کەس بۆ ئەوە دێتە لات بتکوژێت. بەڵام من پێتمگوت؛ عەشق مردنە، عەشق کوشتن نییە. کەی کەسێک لە جیاتی ئەوەی لەو قەبرە دەرتبهێنێت هات لە تەنیشتت پاڵکەوت، کەی لەبەر تۆ وازی لە خۆی هێنا، کەی گیانی خۆی بە تۆ بەخشی، تۆش ئەو کاتە گیانی خۆتی پێبەخشە. چونکە ئەو عاشقە، ئەو تۆی لە گیانی خۆشتر دەوێت.

# ئەو شتانەی کە لە تۆ فێربووم

## نەفام بووم...

هێندە نەفام بووم کە هیچم نەدەبینی و درکم بە هیچ نەدەکرد. وا بیرم دەکردەوە باوەڕکردن لە پرسیارکردن باشترە و متمانەکردن لە گومانکردن باشترە. وامدەزانی هەموو شتێک تا کۆتایی دەخایەنێت. ڕاستە کە دەڵێن مرۆڤ هەتا ئەزموونی شتێک نەکات فێرنابێت! منیش کە لەگەڵ تۆ ژیام و دوام زۆر شتم ئەزمون کرد و فێربووم.

بۆ نموونە، فێربووم کە؛ گرنگترە مرۆڤ کەسایەتی جوانبێت وەک لە ڕوخساری. فێربووم کە ئەو کەسەی خۆشمدەوێت دەبێت بە ویژدان و بەسۆز بێت. فێربووم کە دەبێت کەسم لەوە زیاتر خۆشنەوێت کە شایەنییەتی. فێربووم کە نابێت چاوەڕوانی کەسبم، نابێت زیاد لە پێویستی گرنگی بە کەس بدەم. من لە تۆوە زۆر شت فێربووم. فێری جیاکردنەوەی ڕاستییەکان و هەڵەکان بووم، فێری ئازار چەشتن و خەم خواردن بووم، تەنانەت فێری مردنیش بووم. هەمووی لە سایەی تۆوە فێربووم. فێربووم کە

دەکرێت هیچ شتێک نەکەیت بۆ کەسێک وە بەدەستیشی بهێنیت. فێربووم کە نابێت هیچ کەسێکم زیاد لە پێویست خۆشبوێت.

هەندێک کەس هەیە هەرچییان بۆبکەیت پێی نازانن. ئەگەر زیاتر لەوە خۆشت بوێت کە شایەنییەتی ئەویش زیاتر لەوە ناخۆشیت پێدەدات کە شایەنیت. لە سایەی تۆوە فێربووم نابێت زۆر متمانە بە کەس بکەم. چونکە چەند متمانە بکەیت ئەوەندە بەکاردەهێنرێیت. هەرچەندیش بەکار بهێنرێیت ئەوەندە وێران دەبیت. فێربووم کە کەسێک ڕۆیشت چاوەڕوانی نەکەم. چونکە هەرچەند چاوەڕوانبیت ئەوەندە تەنیا دەبیت. چەند تەنیاشبیت ئەوەندە دەمریت.

## نامەوێت لە یادت بکەم...

جارجار یادت دەکەم. ئەو شریتە لێدەدەمەوە کە تۆی تێدایە، پێکەنینەکانت، قسەکانت، تەنانەت تۆنی دەنگیشت. خەیاڵم دەڕوات و پێدەکەنم. شێتنیم، بەڵام بیرت لێدەکەمەوە و پێدەکەنم.

دەزانـم نـاگـەڕێیتـەوە، دەزانـم جارێکیتر هەرگیز دەستت ناگرمەوە. هیچ لە باوەشت ناگرم، دەزانم جارێکی دیکە هەرگیز ناتوانم بە قوڵی لە چاوەکانت بڕوانم. دەزانم کەسانی چواردەورم سەیرم دەکەن و ورد دەبنەوە، وە مەراق دەکەن بزانن بۆچی بەم جۆرە بێدەنگم. ناتوانم بۆ کەسی باسبکەم، چونکە گەر داوای یارمەتی بکەم، دەڵێن لە یادی بکە. من کە تۆ هەردەم لە خەیاڵمدای چۆن بتوام لەبیرت بکەم؟ ڕاستییەکەی کەسێک بیەوێت کەسێک لەیاد بکات ئاسانە، بەڵام خۆ من نامەوێت لە یادت بکەم...

سـەرەڕای هەمووشتێک بێتۆیی سەختە ... چوارلام خەمە، من لە پایزی خەیاڵەکانمدام. دەڵێیت هەموو خەیاڵەکانم گەڵا گەڵا هەڵدەوەرن. سەیری یادگاریەکانمان دەکەم کە تێپەڕیون. ناتوانم بیانگەڕێنمەوە، وە ئەمەش زۆر بە ئازارە...

**"دەبـــوو نـاوچـەوانـم مـۆری هـەبـوونـتـی پێوەبووایە،**
**نەک پشتم برینی نەبوونیت"**

## بەهێزترین کەس ئەو کەسەیە کە پەنا بە اللە دەگرێت...

ئیرەییت پێدەبەن. کەسە خراپەکان لە پاشەملە باست دەکەن. لە دژت پیلان دەگێڕن و بوختانت بۆ دەکەن. کاتێک دەبینن تۆ بەو شوێنە گەیشتویت کە ئەوان پێی ناگەن زۆر بە زاڵمانە هەوڵدەدەن ڕەشت بکەن. بەڵام تۆ هەر ئارامبگرە، چونکە خودا دادپەروەرە...

ئەو کەسانەی بوختانت بۆ دەکەن ڕۆژێک دەکەونەوە ناو هەمان ئەو پیسییەی کە دەیانویست تۆی تێفڕێدەن. ئەوانەی کە دەخوازن حەیات لەکەدار بکەن، ڕۆژێک خۆیان ڕسوا دەبن. ڕۆژێک دێنە بەردەمت بۆ ئەوەی گەردنیان ئازاد بکەیت. ئەوانەی کە دەیانەوێت خەیاڵەکانت تێک بشکێنن، ڕۆژێک خەیاڵەکانیان پارچە پارچە دەبێت. ڕۆژێک بە شەرمەوە لێت دەڕوانن.

خەم مەخۆ! کێ بیەوێت چ پیلانێکت لە دژ بگێڕێت خودا لە پشتت دەبێت. پلانی هیچ کەسێک لە پلانی خودا بەهێزتر نییە... ئەگەر دەخوازیت لە خراپە و خراپەکاران بە دووربیت پەنا بە خودا بگرە. چونکە بەهێزترین کەس ئەو کەسەیە کە پشت بە خودا دەبەستێت. خودا دەمانپارێزێت و هەرگیز ڕێگە نادات پیلانی هیچکەسێک ئازاری ئەو بەندانەی بدات کە پشتیان بە ئەو بەستووە. لە یادت بێت؛ ئەگەر کەسێک بە تەواوی پشتی بە خودا بەستبێت هەرگیز خودا لە نیوەی ڕێگا بەجێی ناهێڵێت...

## خۆشتبوێت...

خۆشویستنی کەسێک ئاسانە. بەڵام باسکردنی ئەمە بۆ کەسانی دیکە سەختە. کاتێک باسی ئەو ئاسەوار و ئازار و هەستانەت دەکەیت بۆ کەسێکی دیکە، ئەو لەگەڵ ڕووداوەکانی ژیانی خۆی تێکەڵی دەکات. تێناگەن کە تۆ چەند لە ژێر کاریگەری عەشقدایت و چەند خۆشتدەوێت. بە کورتی تۆ باسی چیرۆکی خۆت دەکەیت و ئەوانیش بە ئەزموونی چیرۆکی خۆیان وەڵامت دەدەنەوە.

کاتێک تۆ بۆ ئەو شێت دەبیت پێت دەڵێن گەر ئەقڵت هەبێت خۆشتناوێت. وا بیردەکەنەوە کە تۆ پێویستت بە عەشق نییە پێویستت بە ئەقڵە بە تەنها. کاتێک تۆ دڵت بە بچووکترین ئومێد خۆشە ئەوان دەڵێن پێکەوەبونتان مەحاڵە. تۆ و عەشق و خۆشەویستییەکەت بچووک دەکەنەوە. کاتێک تۆ دەخوازیت لەگەڵ ئەو لە ئاسمان بفڕیت ئەوان دەتترسێنن و دەخوازن بتخەنە خوارەوە. گاڵتە بە بوێریت دەکەن. چونکە خۆیان ئەزموونێکی باشیان نییە، تۆش بە شایەنی دڵخۆشبوون نابینن.

تۆش خۆتبە و گوێ لە کەس مەگرە، ئێستا کە ژیانت ڕێکە و هەموو شت باشە، خۆشەویستی بکە. خۆشتبوێت..

**"عەشق واتە ئەوەی کە تەنها خۆت تێبگەیت لە خۆت ..."**

## نیوەی ڕۆح چاکنابێتەوە...

ئەو کەسەی خۆشتدەوێت دەبێت خاوەن کەسایەتییەکی باشبێت... چونکە کاتێک کەسێکت خۆشدەوێت تەنها دوو هەڵبژاردەت لە بەردەمە؛ یان دەبیتە تاجی سەری، یان دەبیتە خاکی بەرپێی. ئەوەی کە بڕیار دەدات تۆ ببیتە کامیان کەسایەتی ئەو بڕیاری لێدەدات. مرۆڤ هەمیشە ئاسەواری ئەو کەسانە لەسەر دڵیەتی کە خۆشیویستوون. بۆ نموونە؛ چ برینێک لەسەر دڵتە کە بێگانەیەک دروستی کردبێت؟ سەیرێکی برینەکانت بکە، لە ژێر هەموویاندا واژۆی خۆشەویستانت هەیە.

هەموو کەسێک ئازار دەچێژێت گەر کەمیش بێت. چونکە هەموو کەسێک گەر کەمیشبووبێت کەسێکی خۆشویستووە و متمانەی پێکردووە. هەموو برینێک وەک یەک نییە. هەندێک زام بچووکن بە داوای لێبووردنێک چاک دەبنەوە. بەڵام هەندێک زام هێندە قوڵە بە چاویش نابینرێت. کاتێک سەیرت دەکەن بەهێزدیاریت، بەڵام لە ناخەوە خەریکە دەمریت. کەس هەستت پێناکات. هەندێک کەس برینداریشبن وازناهێنن، چونکە ئەوان هیچ کەسێکیان جگە لەوانەی کە خۆشیاندەوێن هەموو ژیانیان بە پەیوەستی یەک دڵەوە بەسەردەبەن. ئەو دڵە بۆ ئەوان یەکەم

و کۆتاییە. ئەگەر کەسێک بەم جۆرە خۆشیبوێن هەرگیز نەکەن ئازاری بدەن، نەکەن بچووکیان بکەنەوە. مەبنە هۆکاری ئەوەی لە ژیان بێزاربن. چونکە ئەوان بێجگە لە تۆ نە کەسیان هەیە و نە هیچ جێگایەکیان هەیە بۆی بچن. گەر ئەو خەمبار بکەن، دەبنە هۆکاری خەمێکی زۆر گەورە...

لە یادی مەکە؛ درۆکردن لەگەڵ کەسێک بە بەردەوامی بەواتای خەڵەتاندنی ئەو کەسە دێت. بەکارهێنانی خۆشەویستی کەسێک بەخراپە واتە برینداركردنی ڕۆحی ئەو کەسە. تۆ خۆتبە، هیچ کەسێک مەخەڵەتێنە و ڕۆحی کەس بریندار مەکە. ئەوەش بزانە ئەو برینانەی کە لەسەر جەستەت دروست دەبن چاک دەبنەوە، بەڵام ئەوانەی سەر ڕۆحت هەرگیز!

گەر ناخوازیت ژیانت لەناوبچێت، دەبێت زۆر بە وریایی ئەو کەسە هەڵبژێریت کە دەبێتە هاوژینت. گەر ناتەوێت جارێکی دیکە ڕۆحت بریندار ببێت دەبێت ئاگاداری خۆتبیت و لە برینەکانی پێشوت فێرببیت، هەموو ئەو ئازارانە کۆبکەوە و لێیان فێرببە. دواتر دەتوانیت کەسێک هەڵبژێریت و خۆشەویستی پێببەخشیت کە شایەنییەتی.

بەڵام دەبێت واز لەو بیرکردنەوە ڕەشبینانەت بهێنیت و بیر لەوە بکەیتەوە کە دەتوانیت جارێکی دیکە کەسێکت خۆشبوێت و متمانەشی پێبکەیت. دونیا چەند کەسی خراپی تێدابێت هێندە کەسی باشیشی تێدایە... لە بیرت بێت؛ گەر کەسانێک هەبن برینداربت بکەن کەسانێکیش هەن چاکت بکەنەوە. گەر کەسانێک

هەبن بەجێت بهێڵن کەسانێکیش هەن لەلات بمێننەوە. تەنها ئەوە بەسە کە تۆ ئەو کەسانەی هەڵیان دەبژێریت خاوەن کەسایەتی باشبن...

**"هەرگیز دوو کەس لە یاد مەکە؛ یەکەم، ئەوەی کە برینداری کردیت. دووەم، ئەوەی کە بە برینەکانتەوە لە باوەشی گرتیت"**

## با من بێمە یادت...

با ڕۆژێک کەسێکت زۆر خۆشبوێت، بەڵام زۆر خۆشتبوێت!
بە بێ ئەو هیچ شتێک مەکە، هەوڵ بۆ دڵخۆشکردنی بدە، با چاوت جگە لەو کەسی دیکە نەبینێت. لەبەر ئەو واز لە هەموو کەس و هەموو شت بهێنە.
با تۆ بە بچووک ببینێت، ئیرەیت پێببات، با بتخاتە گریان، تەنانەت با خیانەتیشت لێبکات. هەرچی بەرامەرت کرد لێی ببورە. هێندە خۆشتبوێت شێتبە شێت!
با ڕۆژێک سەیری چاوت بکات و بە بێمنەتی پێت بڵێت؛ "دەمەوێت جیاببمەوە". با هیچ گرنگی بەو فیداکارییانە و ئەو کردەوانە نەدات کە بۆت کردووە، با بڕوات..
لە خەمدا بکەوەرە سەرجێگە، نان مەخۆ، لەگەڵ کەس قسە مەکە، پەیوەندی پێوە بکە، بڕۆ بۆلای، داوای ئاشتبوونەوە بکە، غرورت بخە ژێر پێیەکانت، هەرچەند لەسەر حەقیشبیت داوای لێبوردن بکە. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە نەگەڕێتەوە بۆلات. تۆش لە ژوورەکەتدا بە تەنیا دابنیشە و بە بێچارەیی بگری. بیر دەکەیتەوە و بە خۆت دەڵێیت من شایەنی ئەمانە نەبووم، کاتێک بەم جۆرە بیرت کردەوە منت بێتەوە یاد!

## قەدەر سێبەری عەشقە...

ئێمە ڕێبوارین، قەدەر ڕێگاکەمانە. دەکرێت هەندێک جار ڕێگاکە بەربەستی لێبێت. ئەمەش وادەکات هەوڵی زیاتر بدەیت بۆ بڕینی ڕێگاکە. دەبێت لە بەردەم ئەو بەربەستەدا بڕیار بدەیت دەجەنگیت یان کۆڵدەدەیت. ئەوەی لەسەرمانە ئارامگرتن و بەردەوامبوونە.

نابێت گلەیی لە قەدەر بکرێت، تەمەن کۆتایی دێت، بەڵام قەدەر کۆتایی نایەت. هەمیشە داوای ئەوە بکە کە خێری تێدایە بۆت. چونکە خودا خێر زیاتر ناهێنێتە ڕێگای ئەو بەندانەی کە خۆشی دەوێت. قەدەرت خۆشبوێت، خاوەنداری بکە. خاوەنداری کردنی قەدەر واتە ڕازیبوون بەوەی کە خودا پێتی بەخشیوە. ئەوەی قەدەری خۆشبوێت خوداش خۆشیدەوێت. ئەوەی قەدەری خۆشنەوێت خۆی زەرەر دەکات.

قەدەر هێڵێکی زۆر بەهێزە. گەر کەسێک لە قەدەرت نووسرابوو شاخیش لەبن بهێنیت لە قەدەرت ناسڕدرێتەوە، گەر کەسێکیش لە قەدەرت نەنوسرابوو زەوی و ئاسمان لەیەکبدەیت بۆت نابێت...

قەدەر سێبەری عەشقە، بۆ هەرکوێ بچێت بە دوایەوەیە. هیچ کەسێک نییە بتوانێت لێی هەڵبێت، هیچ کەسێکیش نییە بتوانێت فێڵی لێبکات.

لە بیرت بێت؛ دڵ مەحکومی عەشقە و عەشقیش مەحکومی دڵە، هەموو کەسێک گەر کەمێکیش بێت لەبەردەم قەدەردا مەزلومە.

خۆشویستنی کەسێک و هەوڵدان بۆی بەس نییە بۆ دڵخۆشبوون. چونکە کەسێکت هەرچەند خۆشبوێت ئەو ئەوەی ویستی لێتدەبات و ئەوی دی دەبێتە خەم و بۆت دەمێنێتەوە.

قەدەر چی بۆت دانابێت هەر ئەوە دەبێت، بەڵام نابێت ڕەشبینیش بێت. ئەو نزایانەی کە بە دڵپاکییەوە دەیکەیت دەتوانن خۆت و قەدەریشت پاکبکەنەوە.

قەدەری هەموو کەس جیاواز نووسراوە، هەرچەند قەدەرمان بە جیا نوسرابێت دەکرێت ببێتە هۆی بەیەکگەیشتنی دوودڵ، وە دەشکرێت ببێتە هۆی جیابوونەوەی دوودڵ، گەر دوو کەس بە ڕاستی یەکدییان خۆشبوێت دەکرێت قەدەریش دەرگای بەختەوەرییان بە ڕوودا بکاتەوە. گەر دڵیان و قەدەریان یەکبگرێت ئەو عەشقە دەکرێت ببێتە داستانی سەر زاران.

ئەگەر قەدەرێکی جوانت دەوێت نزا بکە و لە خودا بپاڕێوە؛

"خودایە کەسێکی وەها بهێنە سەر ڕێم، بە عەشق لە دڵم بنوسرێت و بە قەدەر لە ناوچەوانم".

**"ئەگەر کەسێک لە قەدەرتدا بێت، دوو دڵۆپ ئاویشبن لە ئۆقیانوسێکدا هەر بەیەک دەگەن، ئەگەر دوو دەنکۆڵە لمیش بن لە بیابانێکدا هەر بەیەک دەگەن. ئەگەر لە قەدەریشتدا نەبێت مەحاڵە، هێندەی سێبەریش نزیکبن بەیەک ناگەن ..."**

## ژنە دڵ ناسکەکان

### هەندێک ژن دڵ و ڕۆحیان ناسکە...

بۆ نموونە؛ زۆر زوو دڵیان دەشکێت، زووش چاکدەبنەوە. بە ئاسانی متمانە بە کەس ناکەن، بەردەوام گومان دەکەن. حەز بە پێکەنین دەکەن، وە زۆر نازدارن. هەستەکانیشیان وەک دڵ و ڕۆحیان ناسکە، ناتوانن دڵخۆشی و خەمباریان بشارنەوە یەکسەر پێیانەوە دیارە. زۆر گرنگی بە کەسانی دەوروبەریان دەدەن. حەزدەکەن ئەوانیش خۆشبویسترێن. هەرگیز لە هەڵەی کەس نابوورن و دووجار هەل بە کەس نادەن. مەبەستم ئەوەیە مامەڵە لەگەڵیان کەمێک سەختە... بەڵام بە جۆرێک خۆشیان دەوێیت لە نێو ئەو خۆشەویستییەدا نوقمت دەکەن. زۆر دڵخۆشدەبیت، وا هەستدەکەیت تۆ حوکمی دونیا دەکەیت. ئەو سۆزەی لە ئەوی وەردەگریت لە دایکیشت نەتبینیوە. ئارەزوو دەکەیت تا کۆتایی تەمەنت لەگەڵ ئەو بژیت. مردن لە بیردەکەیت.

بوون بە خاوەنی خانمێکی بەو جۆرە وەک ئەوەیە بوویبیتە خاوەنی هەموو دونیا. ئەگەر ڕێتان لە خانمێکی بەو جۆرە کەوتووە هەرگیز وازی لێمەهێنن. چونکە ئەو هێندە هەوڵتان بۆ

دەدات هێندە، هاوکاریتان دەکات یەک ڕۆژ بەبێ ئەوبن هەموو تەمەنتان هەست بە تەنیایی دەکەن...

وەک گوتم؛ ئازیزەکەم، هەندێک ژن ڕۆحیان ناسکە، ئەوە بزانە ئەو ناسکییە بۆ ئەوە نییە کە تۆ خێرا قبوڵی بکەیت، بۆ ئەوەیە کە تۆ نەشکێیت، بۆ ئەوەیە کە تۆ دڵخۆشبیت. نرخی ئەو ژنانە بزانن.

## بەڵێ لە بیرت دەکەم،
## سەرەتا زۆر سەختبوو...

تۆ کۆتا قسەی خۆت کرد، پشتت لێکردم و ڕۆیشتیت. هیچ شتێکت بە لاوە گرنگ نەبوو. خەم، ئازار، خەیاڵ، هەرچی هەبێت بۆ تۆ لەوێدا کۆتایی هاتبوو. بەڵام من تازە دەستم پێیان کردبوو. کە تۆ ڕۆیشتیت من خۆمم لە دەریای خەم و ئازاردا دۆزییەوە. ڕۆیشتنی تۆ بۆ من ئاگربوو. منت لە نێو ئەو کڵپەی ئاگرەدا بەجێهێشت. هەموو ڕۆژێک، هەموو شەوێک من دەسووتام. ئەوەندە ئازارم کێشا ماوەیەکی زۆر جگە لە خەم چێژم لە هیچ شتێک نەدەبینی. ئاگرێکی هێندە بەهێزبوو مەحاڵبوو نەسووتێم، مەحاڵبوو ئازار نەکێشم. نەمتوانی سەرکەوتووبم، سەرەتا سەرم شۆڕکرد، دواتر کەوتم، پاشان کوژامەوە. هەموو جێیەکم ئازاری چەشت. لە کۆتاییدا بە بێچارەیی بوومە خۆڵەمێش. کات لە تۆ بەسۆزتر بوو!

کات سەرەتا کردمییەوە خونچە، دواتر کۆی کردمەوە و پارچەکانم یەکیان گرتەوە. فێری کردم چۆن لەگەڵ ئەو ئاگرە بژیم. زۆر هاوکاریکردم هەتا ئومێد و باوەڕم بەدەست بهێنمەوە.

دەمگوت زۆر باشە کە کات هەیە. سەرەتا زۆر سەختبوو، بەڵام دواتر هێواش هێواش ڕاهاتم و قبوڵم کرد. فێربووم کە لە عەشقدا چەند دڵخۆشی هەیە هێندە خەمیش هەیە. فێربووم کە

مرۆڤ دەبێت قەدەری چیبێت ئەوە بژی، هەر شتێک لە قەدەریدا نەبێت بێگومان لێیدەڕوات.

ئێستاش گیانم دەسووتێت، بەڵام دەتوانم کۆنترۆڵی ئازارەکانم بکەم. ئیدی قبوڵم کردووە هەرچی قەراربێت ڕوودبات ڕوودەدات. ئێستا دەتوانم بە هەڵەکانی ڕابردووم بڵێم بڕیاری هەڵەمداوە و ئاساییە.

هیچ شتێک وەک جاران نییە. وەک جاران مەراق ناکەم، چیدەکەیت، لەکوێیت، یان لەگەڵ کێیت. دەتوانم بە ئەقڵم بیربکەمەوە و مەنتیقم بەکاربهێنم و دڵم کۆنترۆڵ بکەم. ئیدی دەتوانم ڕاستییەکان ببینم و وەک جاران بە خەیاڵپەرستی ناژیم. هەموو ئەو هۆکارانەی بۆ ترسان و تورەبوونم هەبوون کۆتاییان هات. وەک جاران ڕەشبین نیم. تەنانەت دەتوانم بڵێم پلانم بۆ داهاتووشم داناوە. جاران کە خەڵکی دڵخۆشم دەبینی لە تۆ تورە دەبووم، خەمم دەخوارد و دەمخستەوە ناو دڵم. بەڵام ئێستا کە خەڵکی دڵخۆش دەبینم باوەڕم بە دڵخۆشی زیادی کردووە، هەستدەکەم دەتوانم دڵخۆشببم.

هەرچۆنێک بێت؛ لەبیرکردن چییە و چۆن باسدەکرێت نازانم، بەڵام ئەگەر ئەمانەی باسمکرد بە واتای لەبیرکردن بێت من تۆم لەبیرکردووە.

**"لەبیرت بێت؛ ئەو کاتەی هەوڵ دەدەیت کەسێک لەبیر بکەیت بە ئازارترین کاتە"**

## گەر خۆشیناوێیت دوربکەوە...

کەسێکت هەرچەند خۆشدەوێت خۆشتبوێت، هەرچەند بیری دەکەیت بیکە، نەبوونی ئەو چەند ئازارت دەدات با بیدات، ئەگەر هەوڵت بۆ نەدات، ئەگەر لەبەر بەرژەوەندی تۆی بوێت، ئەگەر لە بەڵێنەکانی پەشیمان بێتەوە، هەرزوو لەو کەسە دوربکەوە. چەند دڵت دەسوتێت با بسوتێت، هەرچەند سەخت بێت بۆت لێی دوربکەویتەوە بیکە، با ئەو ژیانەی کە ماوتە وێران نەبێت...

مرۆڤ کە کەسێکی خۆشویست گرنگی بە هەناسەشی دەدات. گەر کەسێک خۆشیویستیت هیچ شتێکت ئیهمال ناکات. کاتێک کەسێک هەیە هەموو شتێکتی قبووڵە بۆچی کەسێکت دەوێت کە هیچ شتێکتی قبوڵ نییە و بە لایەوە گرنگ نییە. ئەمە تەنها خۆ خەمبارکردنە. ئەگەر ئەو ژیانەی تێیدایت تەنها دوو هەڵبژاردەی پێداویت دەبێت ڕۆیشتن هەڵبژێریت نەوەک مانەوە. چونکە کەسێک تۆی خۆشنەوێت باشتر وایە لەبیری بکەیت وەک لەوەی هەوڵ بدەیت بە خەمباری لەگەڵی بەردەوام بیت...

لە یادی مەکە؛ نە ژیان هێندە هیچە بە ڕاکردن بە دوای کەسێکی بێخێرەوە بە سەری ببەیت، نە تۆش هێندە هیچیت داهاتووت بۆ کەسێک لەدەست بدەیت. دەتوانیت بڕیاری باشتر بدەیت و بەردەوام بیت...

## بڕۆ ئیترا
## مەراقمە!

بڵێ بزانم؛ هەوڵەکانمت پێکەمبوو؟ چی مابوو بۆت نەکەم؟ لەبەر ئەوەی هەموو شتێکم قبوڵکرد و زۆرم خۆشویستی بۆیە تاوانبارم؟ نابینیت چەند بۆت جەنگیم؟ نابینیت لەبەر تۆ چۆن ژیام؟ بابڵێین زاڵمیت و ویژدانت ئازاری نییە؟ باشە لە الله ناترسیت؟

خەمباربووم، شکاوم، خەیاڵەکانم لەناوچوون، هیچ بە خەیاڵتدا نایەت من چیم بەسەرهاتووە. ئەم بێمنەتییەی تۆ منی کوشتووە دەزانیت؟

دەڵێیت کە بێزارم کردوویت و زۆر سەرم خستۆتە سەرت! ئەی بۆ ناڵێیت من هیچ خۆشم نەویستوویت! تۆ چۆن باجی ئەم خراپانەت دەدەیت؟ بۆچی کەسێکت خەڵەتاند کە خۆشیدەویستی؟ هیچ شەرم ناکەیت لەم بیانوانەی کە دەیگریت؟

بڕۆ ئیترا!

لە چاوم، لە دڵم، لە ژیانم بڕۆ ئیترا!

لە خەیاڵەکانم، لە جەستەم، لە هەموو شتێکم بڕۆ ئیترا!

**"فێربین بەر لەوەی کار لە کار بترازێت نرخی یەکدی بزانن، چونکە دواتر کێویش کون بکەن بێسوودە"**

## بەهەڵەدا دەچیت!

دەبێت چیتر بژیت بۆ ئەوەی بزانیت ئەو شایەنی تۆ نییە؟
چەندیتر خەم دەخۆیت؟
چەندیتر ئازار دەکێشیت؟
کەی واز لە داهاتووت دەهێنیت؟
گریایت، وێرانبوویت، ئەو هەموو خەمەت خوارد، چی گۆڕا؟
وادەزانیت بەوەی خۆت زیندانی ژوورەوە بکەیت چی دەگۆڕێت؟

ڕاستییەکان قبوڵ بکە ئیتر. لەوە زیاتر خۆت وابەستەی خەیاڵ و ئومێدی بۆش مەکە. لەوە زیاتر خۆت بۆ کەسێک ماندوو مەکە کە تۆی ناوێت. هێشتا چاوەڕوانی ئەو کەسەیت کە تۆی بە لاوە گرنگ نییە؟ ئەوەی کە تۆی لە ڕابردوودا بەجێهێشتووە پێتوایە لە داهاتوودا چاوەڕوانت دەکات؟ بەهەڵەدا دەچیت!

لە یادی مەکە، ژیان هەلی دیکەت پێدەدات. ئەگەر ناتەوێت ئەو هەلانە لەدەست بدەیت، هەرچی زووە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆت بکە، لە بیرکردنەوە نەرێنییەکانت خۆت ڕزگار بکە. بڕیاری ڕاست بدە و دەست بە ژیانێکی نوێ بکە.

## خەمبارمەبە!

خەم بۆ ئەو کەسانە مەخۆ کە وازیان لێت هێناوە و ڕۆیشتوون. ڕەشبین مەبە و بیر لە شتی خراپ مەکەرەوە. دڵی تۆ شایەنی ئەوەیە بکرێتە تاجی سەر، خۆت بۆ ئەو کەسانە خەمبار مەکە کە شایەنی دڵی تۆنین. ئارام بگرە! هەر شتێک تۆ خاوەنی ڕاستەقینەی بیت کەس ناتوانێت لێت وەربگرێت. ئەوان کە شتێکت لێ دەبەن هیچ سودێکی لێ وەرناگرن، چونکە تۆ خاوەنیت. ڕۆژێک دێت کەسێک هەموو ئەو کەموکورتییانەت تەواو دەکات کە بۆش جێماوە.

خەمبار مەبە!

ژیان بەردەوامە، باوەڕم پێبکە هەموو برینێک چاک دەبێتەوە، هەموو ئازارێک کۆتایی دێت. هیچ شتێک تا سەر بەردەوام نابێت. هەموو شتێک تەواو دەبێت، فرمێسک و گریان، خەیاڵ و دەردەکانیش. هەر خەمێک کە پێتوایە تەواو نابێت دەبێت! هەر شتێک کە پێتوایە چاکنابێت دەبێت! ڕۆژێک دێت سەرلە نوێ متمانە بە خەڵکی دەکەیتەوە و جارێکی دیکە دڵخۆش دەبیتەوە.

**"خەم مەخۆ، هەرچەند خەمەکانت گەورەبن**
**هێندە دڵخۆشی لە داهاتوودا چاوەڕوانتە"**

## عەشقە کاتییەکان...

ئێمە عەشق لە وەستاکانیەوە فێربوین. لە لەیل و مەجنون، لە شیرین و فەرهاد، لە ئاسڵ و کەرەم فێربووین. ئێمە لەنیگاکانی هولیا و ئەدیزەوە فێربووین. لە باوەشەکانی عادل و مونیرەوە و لە کۆڵنەدانی ئایشەگوڵەوە فێربوین. لە سایەی ئەوانەوە فێربووین ئارامگرتن و کۆڵنەدان و هەوڵدان چەند سیحراویە. لە سایەی ئەوانەوە تێگەیشتین عەشق دەتوانێت چ هێزێک ببەخشێت بە عاشق.

کە چیرۆکی ئەوانمان دەبیست بە خەیاڵی عەشقێکی پاکەوە گەورەبووین. کاممان خۆمان نەخستۆتە جێی ئەوان بە خەیاڵ ... بۆیە ڕۆژێک کە عەشق لەدەرگای داین وامان دەزانی گەر ئێمە وەک تورکان بین ئەویش دەبێتە قادر بۆمان. وامان دەزانی وەک فیلمەکان کۆتاییەکی خۆشمان دەبێت. لەوێدا هەڵەمان کرد! ئەوانەی کە هاتن نە وەک قادر بوون، نە قەدریان زانین. گوتمان خۆشیان دەوێین، خۆشیان نەویستین. گوتمان نارۆن ڕۆیشتن. گوتمان دەگەڕێنەوە نەگەڕانەوە. لە کۆتاییدا تێگەیشتین ئەوان عەشقێکی کاتیبوون.

**"عەشق چیرۆک نییە تا هەر کەسە باشەکان بیبەنەوە"**

من تەنیانیم...

خودا ویژدان و دڵت بداتێ
هەتا
هەموو شەوێک ئەو خراپانەت بێتەوە
یاد کە بەرامبەر بە من کردت.

# خەم مەخۆ، خودا گەورەیە...

## دڵیان سوتاندیت

نیەتە پاکەکەت، خۆشەویستییەکەت، وە میهرەبانییەکەتیان بە خراپە بەکارهێنا! وەک شەیتان عەشقەکەتیان لە ناوبرد. گرنگیان پێدایت و وایان دەرخست کە خۆشیان دەوێیت، بەم جۆرە خۆیان نزیک کردەوە و لەبەر بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەردەوام تۆیان دەخەڵەتاند! یاریان بە هەستەکانت کرد، تۆ لە ناختدا بەهەشتت بۆ دروستکردن، ئەوانیش تۆیان فڕێدایە جەهەننەمەکەیانەوە. هیچ گرنگیان بەوە نەدا کە تۆ چەند خەم دەخۆیت و دواتر چیت بەسەردێت. خەمباریان کردیت، شکاندیانیت، ڕۆڵیان گێڕا... وایانزانی هەموو شتێک لەوێدا کۆتایی پێدێت، نەیانزانی لێپرسینەوەی خودا ماوە. گەورەیی خودایان لە یادکرد. ئەگەر ئەوانیش لە یادیان کردبێت تۆ لە یادی مەکە! خودا هێندە گەورەیە کە هەر ساتێک بخوازێت زەوی تەخت دەکات.

هیچ خەم مەخۆ! سزای ئەوە وەردەگرن کە کردوویانە. خودا هەر ڕۆژێک بێت بیریان دەخاتەوە. هەر ڕۆژێک بێت لێپرسینەوە لەو کەسانە دەکات کە تۆیان خەمبار کرد و دڵیان شکاندیت. تەنها ئەو هێزی ئەوەی هەیە لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکات و سزایان بدات. هەر ئەو تۆ بە دڵخۆشی بێکۆتا دەگەیەنێت، ئارامبگرە...

## ئێستا گەر بڵێم هەموو شت چاکدەبێتەوە باوەڕم پێناکەیت...

دەزانم خەریکە ئومێدت لەدەست دەدەیت! ئەوەی کە تێیدا ژیایت هەتا قوڵایی ناخت کاریلێکردویت. وادەزانیت جارێکیتر هەرگیز دڵخۆش نابیتەوە و پێناکەنیتەوە. بە جۆرێک هەمووشتێکت بەلاوە پوچە، کە خۆت لە هەموو کەسێک و هەموو شتێک بەدوور گرتووە. قسە لەگەڵ کەس ناکەیت و ناتەوێت کەست لە لا بێت. لە مێشکتدا سیناریۆ و خەیاڵی پوچ دروست دەکەتت و ناخی خۆتت خواردووە. ئازاری خۆت دەدەیت... ئێستا گەر پێت بڵێم هەموو شتێک چاک دەبێت باوەڕم پێناکەیت. گەر بڵێم سەرلەنوێ دڵخۆش دەبیت، پێدەکەنیت و هەیەجانت بۆ دروست دەبێتەوە هەرگیز باوەڕ ناکەیت. وادەزانیت گاڵتەت پێدەکەم!

باشە بۆ نابێت؟! بڵێ، کەی بووە خودا بەندەیەکی تا کۆتایی لە ئازاردا بەجێهێشتبێت؟ تۆ کە هێندە دڵت پاکە و هێندە باوەڕت بە خودایە بۆچی ئەو ژیانێکی نوێت پێنەبەخشێت؟ ئەو خودایەی کە خاوەنی زەوی و ئاسمان و ئەستێرە بێشومارەکانە توانای ئەوەی نییە تۆ دڵخۆش بکاتەوە؟ ئەو کە نزای خراپەکارانیش قبوڵ دەکات نزای بەندەیەکی دڵپاکی وەک تۆ قبوڵ ناکات؟ ئومێد لەدەست مەدە! هەموو شت باشدەبێت...

گەر تۆ بەردەوام بیت لەوەی وەک کەسێکی باش بژیت، ونیش ببیت دڵخۆشی هەر دەتدۆزێتەوە. چونکە خودا بێگومان بەندە باش و پاکەکانی خەڵات دەکات. دەتوانیت سەربکەویت! دەتوانیت هەموو شتێک لە ڕابردوودا بەجێبهێڵیت. دەتوانیت سەر لە نوێ هەستیتەوە سەرپێ. دەکرێت دیسانەوە لە دایک ببیتەوە. کێ هەوڵدەدات بتهێنێتە خوارەوە با هەوڵبدات، کێ ئازارت دەدات با بیدات. لە دژی هەموویان بجەنگە و هەستەوە سەرپێ. دەبێت فریای ژیان بکەویت، چونکە هەر بەردەوامە. بیر لە شتی باش بکەرەوە و خەیاڵی جوان بکە، داوای شتی باش و جوان بکە لە خودا.

ئەوە لە دڵ و مێشکت دەرمەکە کە داهاتووت خۆش دەبێت. هەرچی ڕوووبدات تۆ باوەڕت بەوە هەبێت ڕۆژێک دێت هەموو شت باش دەبێتەوە. تۆ تەنها دڵخۆشی بخوازە. تۆ تەنها باوەڕ بکە ئەم ڕۆژە خراپانە کۆتاییان دێت. هەرگیز واز لە هەوڵدان مەهێنە. لە بیرت بێت خودا بە سۆزە. گەر تۆ باوەڕت هەبێت دڵخۆش دەبیت ئەو بۆچی پێت نادات؟ هەرگیز ئەمە لە مێشکت دەر مەکە؛ کێ دەڕوات با بڕوات، تەنیا نیت. کێ پشتت لێدەکات با بیکات، چونکە تۆ خودایەکت هەیە هەرگیز تەنیات ناکات ....لە یادی مەکە...

**"نەکەیت وازبهێنیت، جوان نییە**
**خودات لەدڵدا بێت و کۆڵ بدەیت"**

## تێڕوانینی جیاواز...

وەک یەک نەبووین، وەک یەکیش خۆشەویستی لە دڵماندا نەبوو. لە سەر هێڵێک بووین لەنێوان عەشق و بەرژەوندیخوازیدا. تێڕوانینمان بۆ عەشق، هەوڵدانمان و تێگەیشتنمان بۆ دڵخۆشی زۆر جیاواز بوو. پێموابێت ئێمە تێڕوانینمان زۆر جیاواز بوو. من بە دوای دڵخۆشبوونەوە بووم، تۆش بەدوای خراپ بەکارهێنانیەوە. من خۆشەویستیم پێشخستووە و تۆش بەرژەوەندییەکانت. من کە باشەی ئەوم دەویست ئەو بەدوای خەیاڵی خراپەوە بوو. بەکارهێنانی هەستەکانم وای لێکردم هیچ باوەڕێکم بە عەشق نەما ... ڕۆژ هات و ڕۆیشت عەشق جێگای پڕبوەوە و لەیادکرا. ئیتر کە ئەوم دەبینی هەیەجانم بۆ دروست نەدەبوو. هیچ هەستێکم نەبوو، بە قسەکانی نە دڵم خۆشدەبوو نە خەمبار دەبووم. گەیشتبوومە ئەو بڕوایەی هەموو پەیوەندییەکەمان لەسەر بەرژەوەندی بەندبووە و هیچ زیاتر نەبووە. ئەو هەر خۆی نەبووبوو بە هی من، منیش لەوە زیاتر نەمدەتوانی لەلای کەسێکبم کە هی من نییە. بڕیارمدا، بڕیاری لەبیرکردن. سوێندم خوارد کە چیدی کەسم بەو جۆرە خۆشنەوێت. وە ڕۆیشتم..

## ئەو ڕۆژە وەرە بۆلام...

دەڵێن لەم دونیایەدا هیچ خراپەیەک بێ سزا نامێنێتەوە، هەموو شتێک بەرامبەرێکی هەیە، شەو ڕۆژی هەیە، ژیان مردنی هەیە، خەم دڵخۆشی هەیە. وە هەموو کەسێک ڕۆژێک پاداشت و سزای کردەوەکانی وەردەگرێت. مادەم هەموو شتێک بەرامبەرێکی هەیە تۆش ڕۆژێک وەک من کەسێکت خۆشدەوێت. من چەند بیری تۆ دەکەم تۆش هێندەی من بیری کەسێک دەکەیت. تۆش بە هەمان ڕێی مندا دەڕۆیت و هەمان ئازار دەکێشیت. وەک من ناخت بۆ کەسێک دەسوتێت. ڕۆژێک دێت تۆش دەگریت هەتا چاوەکانت وشک دەبنەوە. بە هەناسەی خۆت دەخنکێیت. ڕۆژێک وەک ئەوەی من باوەڕم بە کەسێک کرد تۆش باوەڕ و متمانە بە کەسێک دەکەیت و ئەویش وەک چۆن تۆ منت خەڵەتاند دەتخەڵەتێنێت. تێدەگەیت بێچارەیی و هەڵخەڵەتان چۆن هەستێکە. تۆش ڕۆژێک وەک من بەدەستی کەسێک کە خۆشتدەوێت پارچە پارچە دەکرێیت.

پەلەم نییە، بە ئارامی چاوەڕوان دەبم. کاتێک ئەو ڕۆژە هات وەرە بۆ لام باشە؟ لە سایەی تۆوە لە تۆ زیاتر ئەزموونم هەیە. فێرتکردم چۆن مرۆڤ دەتوانێت بەرگە بگرێت و نەمرێت ئەگەر بەم جۆرەی بەسەربێت.

## هەرگیز خۆت ون مەکە!

بۆچی هێندە ڕەشبینیت؟

بۆچی وا هەستدەکەیت سەرکەوتوو نابیت؟

بۆچی متمانە بە خۆت ناکەیت؟

تۆ کە بە تەنیا بەم ڕۆژە گەیشتویت دەتوانیت ڕۆژەکانی دیکەش بە تەنیا بەڕێ بکەیت. تۆ تەنیا نیت! هەتا ئێستا بە بێ ئەوەی موحتاجی کەس بیت ژیاویت، لەمەودواش هەروا دەژیت. لە یادتکرد؟ تۆ چیت تێنەپەڕاند؟ بەرگەی چیت نەگرت؟ ئەو هەموو سەختییەت تێپەڕاند، بێگومان بەسەر ئەم ڕۆژانەشدا زاڵ دەبیت. ئەمە قبوڵکە، پێویستت بە هیچ کەسێک نییە، نە بەو کەسانەی هەڕەشەی ڕۆیشتنت لێدەکەن، نە ئەو کەسانەی پشتت لێدەکەن. چونکە گەر کێشەیەکت هەبێت تەنها تۆ دەتوانیت و دەزانیت چۆن چارەسەری بکەیت. بۆیە بەر لەوەی موحتاجی کەس ببیت خۆت کۆ بکەرەوە و خۆت ون مەکە!

دەبێت جارێکی دیکە باوەڕ بە خۆت بکەیت و هەوڵ بدەیت پلان بۆ داهاتووت دابنێیت. لە یادی مەکە، گەر سودت بۆ خۆت نەبێت کەسیش سودی بۆت نابێت. تۆ خۆتبە و بۆ هیچ کەسێک خۆت ون مەکە.

**"کەسێک خۆی ونکردبێت وەک ئەوە وایە هەموو دونیای لێ ونبووبێت"**

## ڕاستیخواز بە!

ڕاستیخواز بە! چونکە ژیان هێندەی خەیاڵەکانت پاک نییە. دەکرێت کەسێک کە دێتە ژیانتەوە هێندەی تۆ دڵپاک نەبێت. هەندێک جار قسەیەک یان نیگایەک دەکرێت ببێتە هۆی خەڵەتاندنت و واتلێدەکات بڕیاری هەڵە بدەیت. بۆ نموونە؛ دەکرێت خەونەکانت زۆر گەورەبن، بەڵام ئەو کەسەی خۆشتدەوێت زۆر بچووک بێت. کاتێک تۆ ئەوت بە دەرمان دەزانی بۆ دەردەکانت و پێتوابوو دڵخۆشت دەکات ئەو بووە ڤایرۆس و نەخۆشی خستیت. دەکەویتە گومانەوە خەیاڵەکانت بەرامبەر بە ڕاستییەکان هەرەس دێنن. ڕۆژێک دێت ئەو کەسەی قارەمانی خەیاڵەکانت بوو دەبێتە کابوسی ژیانت...

واقعبین بە! چونکە خەیاڵەکان مرۆڤ بە هەڵەدا دەبەن. خەیاڵەکان بێ کەموکورتین، بۆیە کاتێک لە ژیانی ڕاستیشدا کەسانێک دەبینین پێمانوایە بێکەموکورتین. سەد خەیاڵ هێندەی ڕاستییەک گرنگ نییە. مرۆڤی ئاقڵ ڕاستی بە خەیاڵ ناگۆڕێتەوە.

لەبیرت بێت، گەر دەتەوێت خەمبار نەبیت دەبێت واقیعبین بیت، ژیان یاری نییە، نە دەبێت یاری بە خەڵک بکەیت، نە خۆت بکەیتە یاری هیچ کەسێک...

## ئەمانەتی خودای بکە!

خەڵکی هەر خراپەیەکت بەرامبەر دەکەن با بیکەن، هەر پلانێک دابنێن بۆ لەناوبردنت سەرکەوتوو نابن، گەر تۆ پەنات بە خودا گرتبێت، خۆت و داهاتووت ئەمانەتی خودا کردبێت مەترسە. هیچ خراپەیەک و هیچ پلانێکی شەیتانی ناتوانێت زیان بە کەسێک بگەیەنێت کە لە ژێر پارێزگاری خودابێت. ئەمە لە یاد مەکە.

لە هەرچیدا دەژیت بژی، ئەگەر لە بەندە باشەکانی خودابیت لەبەر قاپی خودا ڕووبەڕوی ئەو کەسانە دەبیتەوە کە خراپەت بەرامبەر دەکەن. ئەوان لە پشتتەوە چاڵت بۆ هەڵدەکەنن؟ مەترسە! خودای گەورە سەبری یوسفت پێدەدات. دەیانەوێت گڕ لە ناخت بەربدەن؟ مەترسە! خوای گەورە ئیمانی حەزرەتی ئیبراهیمت پێدەبەخشێت. دەیانەوێت ڕێت لێبگرن؟ خودا غیرەتی حەزرەتی ئادەمت پێدەبەخشێت. ئەوان چیدەکەن با بیکەن، تۆ دوعا لەسەر دوعا بیکە. متمانە بە خودا بکە و هەرگیز مەترسە! چونکە خودا دوعاکانت وەک حەزرەتی نوح قبوڵ دەکات. تۆ تەنها باوەڕت بەوە هەبێت کە هەموو شتێک چاکدەبێتەوە و لەم دۆخە ڕزگارت دەبێت. تۆ تەنها بەردەوامبە لە هەوڵدان.

ئەوەی دیکەی ئەمانەتی خودا بکە!

## بەبردنەوەکانت بەرەوپێش دەچیت

دەزانیت گەورەترین هەڵەت چییە؟

جوانترین ساڵەکانی تەمەنت بە ئازرچەشتن بەسەر دەبەیت کە خەڵکانێکی بێنرخ توشیان کردویت. خۆت لە نێو ڕووداوەکانی ڕابردوودا سجن کردووە و لە بیرتکردووە کە تەمەنێکی درێژت لە پێش ماوە. بە خەیاڵی بۆش و ڕەشبینانە پێش بەو جوانیانە دەگریت کە دەکرێت لە داهاتوتدا ڕووبدات. بۆ ڕابردوویەک کە تێپەڕیوە خەریکیت داهاتووییەک لەناو دەبەیت کە دەستی پێنەکردووە.

بەڵێ دڵت شکا، بەڵام لەبەر ئەوەی دڵت شکاوە نابێت خێرا بێئومێد بیت، دەبێت بۆ حیکمەتەکەی بگەڕێیت. دەبێت ئەوەت لەبیربێت کە خودا تاقیتدەکاتەوە. خودا خاوەن گەورەترین حیکمەتە. ئەگەر خودا ڕێگەی دابێت ئازار بکێشیت ئەوە بۆ ئەوەیە کە لە ئازارێکی گەورەتر بتپارێزێت، بۆ ئەوەیە کە فێرببیت و هەڵە نەکەیتەوە.

گەر دەتەوێت ژیانت بەدەستبهێنیتەوە دەبێت واز لە هەندێک شتی ڕابردووت بهێنیت. دەبێت زیاتر باوەڕت بە داهاتووت هەبێت بۆ ئەوەی لەو جێیە هەستیتەوە کە لێیکەوتوویت. گەر دەتەوێت خێراتر ڕێگاکەت ببڕیت دەبێت بزانیت بە بردنەوەکانت بەرەوپێش دەچیت نەوەک بەو ڕابردووەی کە لەدەستت داوە.

"ئەگەر بۆ دەرمانێک دەگەڕێیت
ئازارەکانت کەم بکاتەوە، دەبێت
دەستەکانت بەرز بکەیتەوە و نزا بکەیت،
چونکە نزا گەورەترین شیفایە. وە لە یادی
مەکە، خودا هەرگیز ئەو دەستانە بە
بەتاڵی ناگەڕێنێتەوە کە ڕوویان
لەو کردووە"

## سەبر لە ژیانتان بگرن،
## نەوەک لە کەسەکانی ناو ژیانتان...

سەبرگرتن بەرگەگرتنی ئەو ناحەقییانەیە کە بەرامەرتان دەکرێت، ئەوە نییە کە سەبربگرن بەرامبەر ئەو کەسانەی ناحەقیتان بەرامبەر دەکەن. ئەگەر دەخوازن هۆکاری خەمخواردنتان کەم ببێتەوە، دەبێت بزانن بەرامبەر بە چی سەبر دەگرن و کەی خاڵی کۆتایی دادەنێن. نابێت بە هەر ناخۆشییەک بەسەرتان دێت بڵێن خودا داویەتی و قبوڵی بکەن و بێدەنگ ببن. بۆ نموونە کەسێک ئازارتان بدات سەبر بگرن بەرامبەر ئەو ئازارەی لە ناختاندا دروستبووە. بەڵام دەبێت هەرچی زووە ئەو کەسە بەجێ بهێڵن کە ئازاری داون. کاتێک لە کارێک سەرکەوتوونابن ئارام بگرن، بەڵام بەرامبەر ئەو کەسانە ئارام مەگرن کە دەبنە هۆکار بۆ شکستخواردنتان.

فێربین کە چۆن پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانە بپچڕێنن کە هەڵەتان بەرامبەر دەکەن و زیانتان پێدەگەیەنن. لە یادی مەکەن؛ دەکرێت خودا بە کەسی خراپ تاقیتان بکاتەوە، بەڵام ئەوە لەدەست ئێوەیە کە بڕیار بدەن ئەو کەسانە لە ژیانتان بهێڵنەوە

یان دەریان بکەن. خاوەن بڕیاربن؟ مەترسن، گومان مەکەن. هەڵە نییە گەر مرۆڤ هەوڵ بدات ژیانی لەو کەسانە پاکبکاتەوە کە زیانیان پێگەیاندووە و ئازاریان داوە. چونکە دەبێت ئارامبگریت بەرامبەر بەو خەمانەی خودا دەیدات نەک بەندەکانی...

**"گەر ئارام دەگرن بەرامبەر ژیان، ئارام بگرن نەوەک ئەو کەسانەی لە ژیانتاندان"**

## بۆ ئەوەی بە دڵخۆشی و ئارامی بژین
## گەردەتانەوێت بە دڵخۆشی و ئارامی بژین...

بۆ هیچ کەسێک خۆتان بچووک مەکەنەوە، وە ڕێگە بە هیچ کەسێک مەدەن زیاد لە جارێک خەمبارتان بکات. شەرم مەکەن لە هەوڵدان بۆ ئەو کەسانەی کە شایەنین. هەرگیز دڵۆپێک فرمێسک مەڕێژن بۆ ئەو کەسانەی کە شایەنی نین.

هەوڵبدەن بەرامبەر بە هەموو کەسێک و هەموو شتێک بەهێزبن. گەر نەشتوانن بەهێزبن دەریمەخەن. چونکە ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت زیانتان پێبگەیەنن بۆ ساتێک دەگەڕێن کە بێهێزبن. هەرگیز ئەو هەلەیان پێمەدەن... کاتێک لە دەورتان کەسانێک هەن دڵتان خۆشدەکەن هەرگیز بەدوای شتی مەحاڵ مەکەون. نرخی ئەو کەسانە بزانن کە لەلاتانن. بەدوای شتانێکدا ڕامەکەن کە دەزانن بۆتان نابن، با ئەو کەسە باشانەش لەدەست نەدەن. تۆ خۆتبە و هەردەم باوەڕت بە خودا هەبێت. با هەرگیز دوعا لە دەم و دڵتان دوور نەبێت. شوکربن بۆ شتە باشەکان، بەرگەی شتە خراپەکانیش بگرن.

لە یادی مەکەن، گەر بەم جۆرە بەردەوامبن دڵخۆشی و ئارامی هەرگیز لیتان دوورنابن.

## خودا لە یادی ناکات!

ڕۆژێک دێت هەموو توڕەییەکەت لەیاد دەکەیت، خەمەکانت ئاسەواریشیان نامێنێت. دڵشکاوییەکەت و خەیاڵەکانت لە بیردەچێتەوە. ئەو شتانەت بیرنامێنێت کە پارچە پارچەیان کردوویت. ئەو بێهەستییەی ئەو لە یاد دەکەیت ، ئەو شەوانەی بێداربوویت، ئەو کردەوانەی ئەو کردی بەرامبەرت، هەمووی لە یاد دەکەیت، بەڵام هەرگیز خودا لە یادی ناکات!

کاتێک تۆ لە ئازار پاکدەبیتەوە، ئەو دەستدەکات بە ئازار چەشتن. خودا کەسی باش دەخاتە سەر ڕێگای تۆ و کەسی خراپ بۆ سەر ڕێگای ئەو. کاتێک تۆ ژیانت ڕێکدەبێتەوە ئەو ژیانی دەست بە تێکچوون دەکات. کاتێک تۆ شوکر دەکەیت بۆ ئەوەی لەو ڕزگارتبووە، ئەو پەشیمان دەبێتەوە کە تۆی لە دەست دەرچووە. ڕۆژێک دێت خودا دەفتەرەکانمان دەکاتەوە. هەموو ئەوانەی بەسەرت هاتوون یەک یەک بەسەر ئەوی دەهێنێتەوە. کاتێک تۆ بە ئارامی دەنوویت، ئەو فێردەبێت بێخەوی چییە. کاتێک تۆ پێدەکەنیت ئەو فێردەبێت خەمباری چییە. کاتێک تۆ دەبیتە خاوەن باوەشێکی گەرم، ئەو فێردەبێت تەنیایی چییە، فێردەبێت چۆن

هەستێکە گەر کەسێک لە نیوەی ڕێگا بەجێ بهێڵێت. هیچ خەم مەخۆ، ڕۆژێک دێت خودا مافی هەموو کەسێک وەردەگرێتەوە. تۆ بە دڵخۆشی دەگەیت و ئەو سزای هەموو ئەو کردەوانەی زۆر بە سەختی وەردەگرێت کە کردوویەتی. تۆ تەنها ئارام بگرە تا ئەو ڕۆژەدێت.

## چەند تێبینییەک بۆ خۆم

## دڵێکی پاکت هەیە...

کەسێکی باش و ڕاستگۆیت، بەڵام زۆر خێرا متمانە بە خەڵکی دەکەیت. هیچ لێپرسینەوە لە خەڵک ناکەیت. هەرکەسێک کە دێتە بەردەمت بە ڕاستگۆ و باشی دەزانیت و بەبێ ئاگایی خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی ئەوان دەگەیەنیت. کاتێک وادەزانیت یارمەتی ئەوان دەدەیت ئەوان زیاتر بەکارت دەهێنن و تۆش چاوپۆشیان لێدەکەیت. واز لەم خووەت بهێنە!

ڕێگا دەدەیت خەڵکی هەست و خۆشەویستیت بەکاربهێنن. خۆت وابەستەی دڵێک دەکەیت، گەر لەو دڵەشدا جێگایەک بۆ دڵخۆشی تۆ نەبێت تۆ هەر بەردەوام دەبیت لە مانەوە لەوێ. بۆ ئەوەی کەس دڵی نەشکێت چاوپۆشی لە هەڵەکانیان دەکەیت و لێیان دەبووریت. کاتێک زیانت پێدەگەیەنن و ئازارت دەدەن دەنگ ناکەیت و بێدەنگ دەبیت. ئیتر بێدەنگ مەبە!

زیاد لە پێویست بە ویژدانیت، ئەمە وادەکات زۆرشت لەدەست بدەیت. گەر کەسی بەرامبەر هەڵەی زۆریشی کردبێت بەرامبەر

تۆ، بە دوو قسە و دوو فرمێسک هەڵدەخەڵەتێیت. ڕێگا دەدەیت خەڵکی ویژدانت وەک چەک بەرامبەرت بەکاربهێنن. زۆر جار خۆشت دەخەیتە دۆخێکەوە مافت بخورێت کاتێک لەسەر حەقیش بیت. هەموو شتێک دەکەیت بۆ ئەوەی ئازاری دڵی خەڵکی نەدەیت. بەڵام هەندێک کەس بێئەوەی دڵی پێت بسوتێت بەکارت دەهێنێت. فێربە چۆن دژی ئەو کەسانە بوەستیت کە بەکارت دەهێنن!

ئاگاداری هەڵبژاردنەکانت بە!

بۆ ئەوەی ژیانێکی ئارام و دڵخۆش بژیت، دەبێت ئاگاداری هەڵبژاردنەکانت بیت. هەموو کەس وەک تۆ نیەت پاک نییە. کاتێک کە دڵنیانیت لە بڕیارێک، بە ئەقڵ بڕیار بدە نەک بە دڵ. دەبێت هەرچی زووە کەسە خراپەکان لە ژیانت دەربکەیت و لەگەڵ کەسە باشەکان بەردەوامبیت. گەر دەخوازیت باخچەی دڵت جوانتر بکەیت دەبێت پوش و گیایە زیادەکان لە گوڵەکانت دوربخەیتەوە. تۆ خۆتبە؛ کەسێک مەبە خەڵکی زوو دەستی پێت بگات. گرنگی بە کەس مەدە و بەدوای کەس مەکەوە. چونکە دڵنیابە کاتێک گرنگی بە خەڵکی نادەیت بەنرختریت لە لایان.

## ژیان چی پێیە خشیت تا منی بەرامبەر بگۆڕیتەوە...

ئێمە ئیتر دوو پارچەی عەشقێکی ڕووخاوین، جیابوینەتەوە و دوورکەوتوینەتەوە، ئێمە ئیتر نیگاکانیشمان یەک ناگرێتەوە...

من لە لای خۆمەوە پارچە پارچەبووم و تۆ تەنانەت لە خەیاڵەکانیشمدا جێگات نییە. هەرچەند هەوڵبدەم خۆم کۆبکەمەوە و لێت نزیک ببمەوە تۆ زیاتر دوور دەکەویتەوە. ئیتر قبوڵم کردووە کە هەرچەند بمەوێ جارێکی دیکە لە سفرەوە لەگەڵت دەستپێبکەمەوە، تۆ و من کۆتاییمان هاتووە... عەشق گرنگیپێدانی دەوێت. عەشق واتە گرنگیپێدان! خۆزگە ئەو هەوڵەی بۆ لەبیرکردنی یەکدی دەیدەین بۆ دڵخۆشکردنی یەکدی بماندایە. تەنها دەتوانم بڵێم؛ خۆزگە ئێمە بەسەر ناخۆشییەکاندا سەرکەوتوو دەبووین. بەڵام خێری تێدابێت...

بەڵێ، دەکرێت هەموو عەشقێک تا کۆتایی نەخایەنێت. دەکرێت هەموو کەس جیاببێتەوە. دەکرێت هەموو کەس پەیوەندییەکانی کۆتایی بێت. بەڵام من کە تۆم هەبوو ڕۆیشتن بۆم ئاسان نەبوو. کاتێک دەتوانین دڵخۆشبین بۆچی دووربین لەیەک؟ ئەم

بیرکردنەوانە مرۆڤ لەناودەبەن...

دەزانم من تۆم لەدەستداوە تازە، دەزانم ئەم عەشقە کۆتایی هاتووە و تۆش جارێکی دیکە هەرگیز ناگەڕێیتەوە. بەڵام زۆر مەراقی یەک شت دەکەم، وەڵامی هەموو پرسیارەکانم دەستکەوتووە، بەڵام تەنها وەڵامی ئەم پرسیارە نازانم؛

**ژیان چی بە تۆ بەخشی**
**تا منی بەرامبەر بگۆڕیتەوە؟**

## ئەو خەمبارانەی خەڵک دڵخۆش دەکەن...

دەزانن بۆچی ئەو کەسانەی خەڵکی دڵخۆش دەکەن هەردەم خەمبارن؟ چونکە ئەو خۆشەویستییەی لە ناخیاندا کۆیانکردۆتەوە زۆر زۆرە. زیاد لە پێویست گرنگی بەو کەسانە دەدەن کە خۆشیان دەوێت. بە جۆرێکن گەر دڵیان بخەیتە سەر تای تەرازوویەک هیچ شتێک لەو لایە قورسترنابێت کە دڵی ئەوانی لەسەرە. بۆیە مومکین نییە هێندەی ئەوان کەسێکیان خۆشدەوێت خۆشبویسترێن. هیچ شتێک نییە نەیکەن بۆ دڵخۆشکردنی ئەو کەسانەی کە خۆشیاندەوێن. کاتێک سوپرایز بۆ خۆشەویستانیان دەکەن خۆیان زیاتر دڵخۆش دەبن و هەیەجانیان دەبێت. هێندە هەوڵ دەدەن، هەموو وزەیان بۆ ئەو کەسانە سەرف دەکەن کە لە دڵیاندایە. بەم جۆرە کەسانی دەوروبەریان پاش ماوەیەک فێرە حازرخۆری دەبن. ئەوان بە جۆرێکن هەرگیز بەرگەی خەمباری کەس ناگرن. خێرا دەگەڕێن و هەوڵ دەدەن چارەیەک بۆ کێشەکانیان بدۆزنەوە. خێرا ئاشتیان دەکەنەوە.

بێگومان کەسێک بەم جۆرە هەوڵ بدات بۆ دڵخۆشکردنی

کەسێکی دیکە و هێندە خۆشیبوێت مافی خۆیەتی چاوەڕوانی
هەمان هەڵوێست بێت لەو کەسە. بەڵام زۆر سەختە کەسێک
بدۆزێتەوە وەک خۆی نرخی خۆشەویستی بزانێت. کەسانی
بەرامبەریان یان بە هۆی ئەو گرنگییەی پێیاندراوە لە خۆیا
بایی بوون، یانیش هێندە خۆشەویستی لە دڵیاندا نییە وەک ئەوا
ڕەفتار بکەن و گرنگی پێبدەن. هەر بۆیە ئەو کەسانەی بەردەوا
خەڵکی دڵخۆش دەکەن هەردەم خەمبارن.

**"خۆزگە عەشقیش دادپەروەر بوایە،**
**هەرکەسێک چەند کەسێکی دڵخۆشکرد ئەوەندە**
**دڵخۆش بکرایەتەوە"**

## خودا هەرگیز لێی تێکناچێت...

خۆشتدەوێت، متمانەی پێدەکەیت، خەیاڵی دڵخۆشبوون و خۆشویسترانت دەکەیت. حەز دەکەیت تا سەر ئێسقان بە هەیەجان بیت. بەڵام ئەوەندە ئاسان نابێت. هەر کەسێک کە دێتە ژیانتەوە برینێک لەسەر دڵت جێدێڵێت. ناتوانیت دەردەکانت بۆ کەس باس بکەیت، بەهۆی ئەو برینانەوە کەس نایەوێت. هەموو کەسێک بە ڕابردووت بڕیارت لەسەر دەدات. وە کەسیش داوای مافت لەو کەسانە ناکات کە بەم جۆرەت لەگەڵ دەکەن. کاتێک ئەوان پاڵت دەنێن و دەیانەوێت بتخەنە سەر زەوی هەوڵ دەدەیت هەستیتەوە و لەبەر ئەو هەوڵەش تاوانبارت دەکەن.

بەڵام تۆ چیت کردووە؟

متمانەتکرد، باوەڕتکرد، خۆشتویست. ویستت عەشقێکی پاک و جوانت هەبێت. ڕووی ڕاستی کەست نەبینی. وە بەهۆی ئەمانەوە تاوانبارکرایت.

قەینا، کێ چیت بەرامبەر دەکات با بیکات، تۆ ناخت ئاسوودە بێت. خودا هەیە لە یادی مەکە! ڕۆژێک دێت هەموو ئەو کەسانەی

تۆیان خستە ئەم دۆخەوە، ئەوانەی باسیان دەکردیت، ئەوانەی دەیانزانی لەسەر حەقیت و بێدەنگ دەبوون، هەموویان ڕێیان لە کەسی بێویژدانی وەک خۆیان دەکەوێتەوە. بێگومان لە هەڵەکانیان تێدەگەن، بەڵام ئەو کاتە کار لە کار ترازاوە. خەم مەخۆ گیانەکەم؛ هەر شتێک هی تۆ بێت لێتڕاناکات. هیچ دەردێک لە دوعاکانت بەهێزتر نییە. خەڵک ڕاستییەکانی لێ تێکدەچێت، ژیان لێی تکدەچێت، بەڵام خودا هەرگیز لێی تێکناچێت.

## تەنیاییەکی پڕکوالیتی
## دەزانیت بۆچی کەسە بەکوالیتییەکان بە تەنیان؟

چونکە ئەوان بە ئاسانی ناخەڵەتێن، بە خێرایی باوەڕ بە کەس ناکەن. دیاری گرانبەها چاوی ئەوان ناخەڵەتێنێت. هەرگیز ڕێگە نادەن ئەو کەسانە خۆیانیان بەسەردا زاڵبکەن کە پێیان وایە بە پارە و ماددە دەتوانن هەموو شت چارەسەر بکەن. دەتوانن ئەوان تەنها بە باشی دڵتان و بە کەسایەتیتان ڕازی بکەن. ئەمەش سەبر و هەوڵ و ئارامی دەوێت.

کەسە بە کوالیتییەکان یاسای خۆیان هەیە. بۆ نموونە؛ بەرگەی کەسی لەخۆبایی ناگرن. ڕێگە نادەن کەسانی ساختە لە ژیانیاندا هەبێت. حەزیان بە ئازادی هەیە، بەڵام سنووری دیاریکراویان هەیە. هەرگیز گرنگی بە کەسانێک نادەن وەک خۆیان بە کوالیتی نەبن. سەختە کەسێکی پڕ کوالیتی لە خۆت ڕازی بکەیت. چونکە ئەوان نایانەوێت بە بەرژەوەندی و بە جەستە خۆشبویسترێن، ئەوان دەیانەوێت بە ڕۆح و بە دڵ خۆشبویسترێن. هیچ کەسێک بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکار ناهێنن و ئەو کەسانەشیان خۆشناوێت کە خەڵکی بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاردێنن.

لەم سەردەمەدا خەڵکی حەزیان لە شتی ئاسانە و دەخوازن خەڵکی بۆ خۆیان بەکاربهێنن. بەم هۆیەوە کەسە بە کوالیتییەکان زۆر سەخت خەڵکێک دەدۆزنەوە وەک خۆیان بیربکاتەوە و گرنگی بە خۆشەویستی و ڕێز بدات. هەر بۆیە تەنیایی هەڵدەبژێرن. تەنیا مانەوە کۆتایی دونیا نییە بۆ کەسە بە کوالیتییەکان. چونکە ئەوان پێیان باشترە لە تەنیاییەکی پڕ کوالیتیدا بن وەک لەوەی خاوەن عەشقێکی درۆبن.

## تەنیا و بریندار...

ئێمە کەسانێکی پڕ وزە بووین. پڕبووین لە ژیان، ئومێدمان هەبوو پێکەنینمان هەبوو. باشەی خەڵکمان دەویست. بێئەوەی چاوەڕوانی هیچ بین هاوکاریمان دەکردن. بە باشە بیرمان لە خەڵکی دەکردەوە، بە باشە سەیرمان دەکردن و بە باشە دەژیاین. ڕۆژێک هەستاین هەڵەیەکمان کرد و کەسێکمان خۆشویست، وامانزانی ئەوانیش وەک ئێمەن. کەسێکی بێگانەمان کردە دۆستی خۆمان. متمانەمان پێکرد، چی گوت کردمان، بەردەوام هەوڵماندا بۆ دڵخۆشی ئەوان. بەردەوام کۆڵی ئەو خۆشەویستییەی دڵمان هەڵگرت. لە جیاتی ئەوەی دان بە ڕاستییەکاندا بنێین و باری سەر شانمان سوک بکەین، زیاتر چوینە ژێر باری خەم و خەفەتەوە. چونکە زۆر خۆشمان ویستن! وامانزانی پێکەنینەکانیان بارمان سوک دەکەن. هەرچیمان بۆ کردن نەمانتوانی لە خۆمانیان ڕازی بکەین. کاتێک ویستمان دڵخۆشبین زیاتر لە خۆشی ژیان دورکەوتینەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ گۆشەگیرتر بووین. ڕۆژێک ئاقڵ بووین، بەڵام دواکەوتین. بە هۆی ئەوەی بەردەوام بە باشی مامەڵەمان لەگەڵ کردن و باوەڕمان بە هەموو قسەیەکیان کرد بۆیە بە تەنیا و بریندارماینەوە.

## مرۆڤ خۆی نرخ بۆ خۆی دیاری دەکات...

من هەروا بە ئاسانی بڕیار لەسەر کەس نادەم، سەرەتا دەیناسم، سەیر دەکەم بزانم کێیە، هەوڵ دەدەم بزانم چی لە من دەوێت، بەبێ ئەوەی ئاگاداربێت چەند تاقیکردنەوەیەکی دەکەم. ئەگەر نییەتی باشبێت دەیخەمە سەر سەرم. ئەگەریش نییەتی خراپ بێت دەینێژمە بنی زەوی. هەتا ئەم ڕۆژە من هیچ جیاوازییەکم لە بەینی هیچ کەسێکدا نەکردووە. سروشتی من وایە! هەر کەسێک شایەنی بێت ڕێزی دەگرم و ئەوەی شایەنی نەبێت نایگرم. هەموو کەسێک خۆی جێگا و پلەی خۆی دیاری دەکات. چونکە من وەک ئاوێنەم بۆ هەموو کەسێک. کاتێک سەیرم دەکەن کەسایەتی خۆیان دەبیننەوە لە مندا. ئەوانەی کە نیازیان پاکبوو کردمنە تاج لەسەر دڵم، ئەوانەشی کە نییەتیان خراپ بوو ڕێگەم نەدا لە دەرگای دڵمەوە بچنە ژوورەوە.

هەرچۆنێک بێت، لە ژیانمدا کەسانێک هەبوون کە چاو لە ڕێیان بووم و کەسانێکیش هەبوون لەبەر نەبینینی ئەوان ڕێگام دەگۆڕی. کەسانێک هەبوون بۆ ئەوەی بچمە لایان هەموو شتێکم وەلا دەنا، کەسانێکیش هەبوون بۆ ئەوەی نەیەنە لام بەهانەم دروست دەکرد. کەسانێک هەن یەک هەنگاویش نانێم بۆلایان.

کەسانێکیش هەن لەوپەڕی دونیاشبن هەوڵ دەدەم بیانبینم.
لە کاتێکدا کەسانێک هەن بۆ باوەشێکیان دونیام دەبەخشم،
کەسانێکیش هەن دونیام بدەنێ نایانبەخشم. لە یادی مەکەن؛
مرۆڤ خۆی نرخ بۆ خۆی دیاری دەکات.

## کەسێکت خۆشبوێت کە تۆی خۆشدەوێت...

خەڵکی هیچ هەوڵ نادەن لێت تێبگەن. وادەزانن تۆ تەنها ئەوە دەژیت کە باسی دەکەیت. کەس بیر لەوە ناکاتەوە دەکرێت چی ژیابیت و باست نەکردبێت. بەلای کەسەوە گرنگ نییە دەردت چییە. بە نابەدڵی گوێت بۆ دەگرن و هەوڵ نادەن چارەسەرت بۆ بدۆزنەوە. بۆ نموونە دەڵێیت خۆشم دەوێت، ئەوان دەڵێن گەر خۆشتدەوێت دەبێت هەوڵ بدەیت، بیر لەوە ناکەنەوە ئەو تۆی خۆشدەوێت یان نا. وادەزانن بەو وەڵامە کورتانەی دەیدەنەوە دڵنەواییت دەکەن. بەڵام گرنگی بەو سەختیانە نادەن کە تێیدا ژیاویت. ناتوانیت ئەو وەڵامانەی دەتەوێت لە کەست گوێلێبێت. وەک چۆن لە هەموو ناخۆشییەکدا بە تەنیا بوویت لەمەشیاندا هەروا دەبیت...

با من ڕاستییەکانت پێبڵێم، ئەگەر دەزانیت ئەو کەسەی خۆشتدەوێت تۆی خۆشناوێت، هەرچی زووە وازیلێبهێنە. ئەوە بزانە ناتوانیت بە تەنیا سەوڵی بەلەمێکی دووکەسی لێبدەیت. ناتوانیت بە تەنیا بەرگەی ئەم هەموو بارگرانییە بگریت. ناتوانیت بە زۆر لە کەسێک نزیکبیتەوە کە هەر لە لاشت نییە. ناتوانیت بە

زۆر خۆت لای کەسێک خۆشەویست بکەیت، وە ناتوانیت لەوە زیاتر خۆت ئەزییەت بدەیت. لە یادی مەکە؛ تۆ هەرچەند بوێربیت بەس نییە بۆ ئەوەی لە پەیوەندییەکدا دڵخۆش بیت، ئەگەر ئەو ترسنۆک بێت بوێری تۆ هیچ گرنگییەکی نابێت. تۆ خۆتبە، کەسێکت خۆشبوێت کە تۆی خۆشدەوێت. چونکە ئەو هەرچییەک بێت شایەنی خەملێخواردنە.

## بۆ هیچ کەسێک خۆت مەگۆڕە...

متمانەت بە خۆت هەبێت، هەرگیز واز لە ژیان مەهێنە، خۆت ڕێگای خۆت دیاری بکە. بوێر بە! وامەزانە بە تەنیا دەمێنیتەوە. هەرگیز ئەو کەسانە لە ژیانتدا مەهێڵەوە کە ئازارت دەدەن، یان بێزارت دەکەن. ئەگەر ئەو کەسەی هاوڕێگاتە و شایەنت نییە لە لایەک دایگرە و خۆت بەردەوامبە لە ڕێگای خۆت. هەتا کەسێک نەدۆزیتەوە شایەنت بێت هیچ کەسێک مەکە بە هاوڕێت. خاوەن قەراری خۆتبە! لەو کەسانە دووربە کە داواکارییەکیان هەبوو و جێبەجێت نەکرد تووڕە دەبن. هەرگیز بۆ هیچ کەسێک خۆت مەگۆڕە. لە یادت بێت کەسێک تۆی وەک خۆت قبوڵ نەبێت بێگومان بەدوای شتی دیکەوەیە لەگەڵت. ئاگابە! هەرگیز ئەو کەسانە لەدەست مەدە کە گرنگی بە دڵخۆشبوون و خەمباربوونت دەدەن. ئەگەر کەسێک بە ڕاستی گرنگیت پێبدات دەتوانێت بیکەیتە تاجی سەرت. بەڵام گەر لەبەر بەرژەوەندی و ئارەزووی خۆی لەگەڵت بێت هەرزوو بەڕێی بکە.

بەهێزبە! هیچ چاوەڕوانییەکت لە هیچ کەسێک نەبێت. لەسەر پێی خۆت بوەستە و بەردەوامبە. لە بیری مەکە، هەتا خۆت ئیشی

خۆت بکەیت بەهێزتر دەبیت. با هەڵبژاردنەکانت دروست بێت. کەسی ناتێگەیشتوو و بێڕێز مەهێنە ناو ژیانت. چونکە ئەوان تەنها دەزانن بتهێننە خوارەوە و ئاستت دابەزێنن. بۆیە تۆ خۆتبە و کەسی وەک خۆت خاوەن کوالیتی بهێنە ژیانت. وە کۆتا پێشنیارم بۆت ئەوەیە کە ئەمەک و خۆشەویستیت بۆ کەسانێک بە هەدەر مەدە کە نرخی نازانن و بەکارت دەهێنن. چونکە بە هەدەردان ئیسرافە و ئیسراف گوناهە.

## هەموو شتێکم لەدەست بدەم
## ئومێدم لەدەست نادەم...

خەمبارم! چونکە کەی بمەوێت دڵخۆشبم پەشیمانم دەکەنەوە. بۆ نموونە کە کەسێکم خۆشدەوێت دەردەکەوێت بەرژەوندیخوازە. کاتێک دەردەدڵ لەگەڵ کەسێک دەکەم نهێنییەکانم لە دەمی خەڵکی دیکەوە دەبیستمەوە. کاتێک متمانە بە کەسێک دەکەم لە پشتەوە لێم دەدات. کاتێک دەمەوێت تەنیابم ناتوانم دڵخۆشبم. وا هەستدەکەم گیرم خواردووە! پێم بڵێن ئێوە چۆن دڵخۆش دەبن؟

تەنیام!

چونکە لە عەشقدا بێشانسم. هەر کاتێک بیردەکەمەوە چیم بەرامبەر کراوە دەزانم چەند زەرەرم کردووە. من هیچ کاتێک لە عەشقدا براوە نەبووم. ئەمە بێ شانسییە، یان قەدەرم وایە، نازانم! دەزانم چۆن کەسێکم خۆشبوێت، بەڵام کەس نازانێت چۆن منی خۆشبوێت.

بەڵام بێئومێد نیم!

سەرەڕای هەموو ئەو خاڵە نەرێنیانەی ژیانم، باوەڕم وایە کەسێکی باش هەر ڕۆژێک بێت دێتە ژیانمەوە. باوەڕم وایە دەتوانم داهاتوویەکی جوانم هەبێت. باوەڕم بە خودا هەیە و دەزانم ئەو پاداشتی ئارامگران دەکات. لەبەر ئەوەیە بە ئارامی بەرگەی هەموو شتێکی ژیانم دەگرم.

گەردن ئازایی

لەگەڵ هەموو کەس ناکرێت،

چونکە هەموو کەس شایەنی

لێخۆشبوون نییە!

## ژنەکان دەبێت زۆر خۆشبویسترێن،
## دەزانیت بۆچی دەبێت ژنەکان زۆر خۆشبویسترێن؟

چونکە ئەو ناتوانێت وەک تۆ ئازادبێت و کراوەبێت، بەڵام تەنها لەبەر ئەوەی تۆی خۆشدەوێت بەهانە دەهێنێتەوە بۆ خێزانەکەی هەتا تۆ ببینێت. سەرەڕای ئەوەی ترسی هەیە خێزانەکەی ببینێت بوێرە و دەستی تۆ دەگرێت و چەندین کاتژمێر پیاسەت لەگەڵ دەکات. سەرەڕای ئەوەی لێپرسینەوەی لێدەکرێت خۆی درەنگ دەخات، تەنها بۆ ئەوەی کەمێکی دیکە لەگەڵ تۆ کات بەسەر ببات. کاتێک کێشەیەک یان شەڕێکتان دەبێت تۆ دەتوانیت بڵێیت جەوم نییە و دەچمە ژوورەکەم و دەمەوێت تەنیابم. بەڵام ئەو چانسی ئەوەی نییە!

ناتوانێت وەک تۆ بە ئازادی دڵخۆشی و خەمباری خۆی دەرببڕێت. دەبێت هەرچی ڕوبدات لە ناخی خۆیدا هەڵی بگرێت و وەک ئەوە بژی کە هیچ شتێک ڕووی نەداوە. تۆ هیچ هەوڵتداوە وەک ئەوە بژیت کە هیچ شتێک ڕووی نەدابێت و هەموو خەمەکانت لە دڵتدا هەڵگرتبێت؟

نازانیت ئەوە چەند سەختە، ژنێک سەرەڕای هەموو ئەم بەربەستانە تۆی خۆشبوێت شایەنی خۆشویستن نییە؟ ژنەکان

دەبێت زۆر خۆشبویسترێن.! چونکە ئەو ڕیسکانەی ئەوان دەیکەن زۆر گەورەترە لەو ڕیسکانەی کوڕەکان دەیکەن. بۆ نموونە؛ گەر کوڕێک لەگەڵ خۆشەویستەکەی ببینرێت لە لایەن خێزانەکەی یان خزمەکانییەوە زۆر ئاساییە و پێیان خۆش دەبێت، بەڵام گەر کچێک لەگەڵ خۆشەویستەکەی ببینرێت خێزانەکەی کاردانەوەیەکی زۆر جیاوازیان دەبێت. ئێستا دەپرسمەوە؛ ژنێک هەموو ئەمانە وەلا بنێت و تۆی خۆشبوێت شایەنی خۆشویستن نییە؟

ژنەکان دەبێت زۆر خۆشبویسترێن، چونکە زۆر لە پیاوەکان زیاتر ڕۆحی موجادەلە و هەوڵدانیان هەیە. دەبێت کات بە هەمووشتێک و هەموو کەسێک بدات. بۆ نموونە گەر کار بکات، یان بخوێنێت دەبێت دوای خوێندن یان کارەکەی بێتەوەماڵەوە هاوکاری دایکی بکات. قاپ شۆردن، جل شۆردن، ئوتوکردن و هتد ... دەبێت کات بۆ خێزانەکەی، هاوڕێکانی و خۆشەویستەکەشی بەش بکات و نابێت خۆشی لەبیر بچێت و گرنگی بە خۆشی بدات. وە بۆ هەموو ئەمانە تەنها ٢٤ کاتژمێری هەیە. کوڕەکان پێویست ناکات هێندە کات بەم شتانەوە بەسەربەرن. بیربکەرەوە؛ دەبێت خێزان و هاوڕێ و خۆشەویست و خزمانی لە خۆی ڕازی بکات، ڕووبەڕوی چەندین ڕەخنە و بوختان دەبێتەوە و هیچ کۆڵیش نادات! ژنێک کە موجادەلە لەگەڵ هەموو شتێک و هەموو کەسێک بکات شایەنی خۆشویستن نییە؟

## بیرکردن هەناسەی عەشقە...

مرۆڤ بیری خۆشەویستەکەی دەکات. دەیەوێت هێندەی خۆشەویستی ئەو لە دڵیدایە هێندەش نزیکی بێت. ڕۆژانە چاو لە پەنجەرە و ڕێگان و شەوانیش لە ئاسمان، یان بنمیچی ژورەکانیان. هەندێ جار بە ئارامی و هەندێ جار بە ئازار یان هەیەجانەوە چاوەڕوانی خۆشەویستەکانیان دەکەن. هەرکەسێک بیری کەسێک بکات شێوەی ئەو کەسە دەگرێت. کەسێک دەبێتە هەموو دونیا، بەڵام هەموو دونیا نابێتە کەسێک. ئەو کەسەی بیری کەسێک دەکات هەرچی ڕوبدات لە حەسرەتی کەم نابێتەوە.... کات دەردی عاشقە. هەر چرکەیەک کە تێدەپەڕێت ئەو کونێکیتر دەبێتە دڵی. لە ناخیدا بیرێکی قوڵ دروست دەبێت و لێی دەرناچێت. خۆ ئەگەر ئەو بتوانێت باوەشێک بە مەعشوقەکەیدا بکات، یان دەستی بگرێت هەموو شت چاکدەبێتەوە، بەڵام ناتوانێت، چونکە ئەو لە دوورە. مرۆڤ گەر بیری کەسێک بکات دەگۆڕێت، هەستیار دەبێت، بێدەنگ دەبێت.. دەردەدڵ لەگەڵ گۆرانییەکان دەکات، دەگری و ئارەزووی ژیانی نامێنێت. دڵی قورس دەبێت، ڕۆحی دەلەرزێت، تەنیا دەبێت بێکەس دەبێت. وامەکەن کەس بیرتان بکات، گەر خۆشتاندەوێت بڕۆن بۆلای، گەر خۆشتان ناوێن ئومێدیان پێمەدەن. بیرکردن هەناسەی عەشقە.

”دەڵێن کەس شاهیدی شەو نییە،
درۆیە!
ئێوە باسی شەو لەو کەسانە بپرسن
کە بیری کەسێک دەکەن“

## گوێ بۆ ئەقڵت بگرە...

شششش!
کەی چاوت دەکەیتەوە؟
کەی لەم خەونە هەڵدەستیت؟
بەشی پێویست بێزار نەبوویت
کەی لەم پێستەت دێیتە دەرەوە؟
هۆو لەگەڵ تۆمە؟
دەی ئیتر خۆت کۆبکەوە
کات کاتی ئەوەیە بێیتەوە سەر خۆت
ئیتر کاتی ئەوەیە بیر لە خۆت بکەیتەوە
زۆر ئەو کەسانەت خستە پێکەنین کە تۆیان گریاند
زۆر ئەو کەسانەت دڵخۆشکرد کە تۆیان خەمبار کرد
زۆر گرنگیت دا بەو کەسانەی تۆیان لا گرنگ نییە
لەوە زیاتر لە چاوەڕوانیدا مەبە
ئیتر سەرەی تۆیە
گوێت لە دڵت گرت چیبوو؟
کەمێک گوێ لە ئەقڵت بگرە...

## چەند خولەکێک...

تەنها چەند خولەکێک بەسە بۆ ئەوەی کەسێک هەموو شتێک لەدەست بدات، یانیش بەدەستی بهێنێت. بۆ نموونە؛ کەسێک دەبینیت چاوت لەسەری قفڵ دەبێت، لە ناکاو گەرمییەک بە سنگتدا دێت. دڵت لەجیاتی خوێن هەیەجان پەمپ دەدات. ئەقڵت لەسەر خۆت نامێنێت. چاوتان بە چاوی یەک دەکەوێت. ئەو کە چەند چرکەیەک سەیرت دەکات ناخت ئاگر دەکاتەوە. دڵت دەردێنێت. وەک بڵێیت تۆ دەڕۆیت و کەسێکیتر دێتە جێگات. بە درێژی و بە قوڵی نیگای بۆ دەکەیت. بە چاوت وێنەی دەگریت و بە خەیاڵی خۆت کەسایەتییەکی بۆ دەکێشیت. دڵخۆشییەکی کاتی هەموو گیانت داگیردەکات. ئیتر خەیاڵی داهاتوو وەک شریت بە بەرچاوتدا دێت و دەڕوات. لەو ساتەدا خۆت لەبیردەکەیت، تەنها بیرت لای سەیرکردن و چاو و پێکەنینی ئەوە. ناتوانیت چاوت لەسەری هەڵبگریت و کۆنتڕۆڵی خۆت لەدەست دەدەیت. ئەقڵت جام دەبێت و زیاتر سەرسام دەبیت. ئەو چەند خولەکە بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەیتەوە بێجگە لە ئەو. دواتر دێیتەوە سەرخۆت. بەڵام کە هاتیتەوە سەرخۆت دەبینیت دڵت لەدەستداوە و تەسلیمی ئەوت کردووە. بەر لەوەی دەستپێبکەیت خۆتت لەدەستداوە.

## خۆشی لە خۆت!
## ناخت دەسووتێت؟
## ئازار دەکێشیت؟

گەر وایە ئەوە تۆ کەسێکی باشیت، چونکە کەسە خراپەکان ئازار ناکێشن. هەرگیز گرنگی بەوە نادەن ئەو کەسەی ئەوان زیانی پێدەگەیەنن چی لێدێت. ئازار و خەم تەنها بۆ کەسە باشەکانە، کەسە خراپەکان نازانن ئازار چییە.

لە ئازار کێشان مەترسە، چونکە ئازار کێشان باجی باشبوونە، وە ئەم باجە تەنها لە دونیادا دەدەن، چونکە ئەو باجەی لەم دونیا دەیدەن دەبێتە پاداشتی ڕۆژی قیامەتییان، ئەوانەی ئەو باجە نادەن لە قیامەتدا زۆر بەسەختتری دەیدەنەوە.

خەم مەخۆ!

واز لە باشبوون مەهێنە، تەنها لەبەر ئەوەی ئازار دەکێشیت. نەکەیت بڵێیت خەمبارم و ئیدی ناتوانم، وە کۆڵبدەیت! لە یادت بێت ئەو ئازارانەی دەیچێژیت نیشانەی ئەوەیە لەم دونیا خراپەدا و لە نێوان ئەم هەموو کەسە خراپەدا تۆ بە باشی ماویتەتەوە.

خۆشی لە خۆت!

## خۆم زامەکانم سارێژ دەکەم...

تێگەیشتووم کە هەموو برینێک سارێژدەبێت، وە مرۆڤ دەتوانێت ڕۆژ بە ڕۆژ باشتربێت و کۆنترۆڵی خۆی بکات، گەر بخوازێت. تێگەیشتووم کە تەنیایی هێندەش خراپ نییە. مرۆڤ دەتوانێت بێ ئەوەی هیچ چاوەڕوانییەکی لە هیچ کەسێک هەبێت بژی. دەتوانیت خۆت بڕیاری خۆت بدەیت و خۆت دڵخۆش بکەیت. هیچ شتێک نییە لە دونیادا لە یاد نەکرێت. گەورەترین عەشقەکانیش لە یاد دەکرێن. مرۆڤ دەتوانێت دەرس لە ڕابردووی وەربگرێت، پلانی داهاتوویەکی باش دابنێت. من ئیتر خەیاڵ ناکەم، لە ڕاستییەکاندا دەژیم. ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەبم. گوێ بە خەمەکانم نادەم، ئیتر خۆم زامەکانی خۆم سارێژ دەکەم. پەنا بە خودا دەگرم، بەم جۆرە ئارامترم.

**"هەندێک مرۆڤ لەبەر ئەوە خەمبارنین کە دڵخۆشیان نەویستبێت، لەبەر ئەوەیە کە لە خەمخواردن بێزاربوون"**

## ڕۆژێک دێت زۆر دڵخۆش دەبیت. باشە، ئەمە چۆن دەزانم؟

چونکە لەم دونیایەدا کە خراپەکردن هێندە تێیدا ئاسانە، تۆ ڕێگا سەختەکە و باشبوونت هەڵبژاردووە. لەم دونیایەدا کە درۆکردن و ساختەچێتی بوەتە ئاوخواردنەوە، تۆ ڕاستگۆیی و دروستیت هەڵبژاردووە. سەرەڕای ئەو هەموو خراپەیەی کە بەرامبەرت دەکرێت، هێشتا ڕاست بە پێوە وەستاویت. لەجیاتی ئەوەی بۆڵە بۆڵ بکەیت دەڵێیت تاقیکردنەوەی خودایە و ئارام دەگریت. شەوانە ناتوانیت فرمێسکەکانت ڕابگریت و لە قوڵایی دڵتەوە نزا دەکەیت، وادەزانیت ئەو هەموو دوعایە بە هەدەر دەچێت. هیچ گومانت نەبێت! پاداشتی هەموو بە زیادەوە وەردەگریت. تەنها واز لە باشبوون و لە نزاکردن مەهێنە. ڕۆژێک دێت تۆ زۆر دڵخۆش دەبیت.

## دەترسیت لەوەی لە سەرەتاوە دەستپێبکەیتەوە؟ سەیرێکی ژیانت بکەوە...

سەیری ئەو ئازارانە بکەرەوە کە خەریکبوو دەیانڕوخاندیت. سەیری ئەو کەسانە بکەرەوە کە خۆیان وەک دۆست نیشاندەدا و دووڕوو و ساختەکاربوون. سەیری ئەو کەسانە بکەوە کە دەیانویست یاری بە هەستت بکەن. سەیری ئەو موجادەلە و هەوڵانە بکە دەتدا. دەبینیت چەند بەهێزبوویت. تۆ کە هەموو ئەم جەنگانەت بردوەتەوە و بە سەر هەموو ناخۆشییەکاندا زاڵبوویت ئێستا نابێت هەروا ئاسان کۆڵبدەیت.

بینیت چۆن لەگەڵ ئەو کەسانەی بە نزیکت دەزانین بوونە بێگانە لای یەکدی. هێواش هێواش تێکەڵی ئەو ئازارانە بوویت کە بەهۆی لەدەستدانی ئەوانەوە دروستبوون. زۆر ماندووبوویت، زۆر بریندار بوویت، بەڵام کۆڵت نەدا و بەردەوامبوویت و بۆ ژیانکردن جەنگیت. دونیایان بەسەرتدا ڕوخاند، بەڵام تۆ هەر بە بەهێزی مایتەوە و نەڕوخایت.

تۆ چەندین ساڵ ئازاری خیانەتی دۆستاکنت لە ناو دڵتدا هەڵگرت، ژیان و ئازار ناشرینترین ڕووی خۆیانیان نیشاندایت. هەموو جۆرە ناخۆشییەکت بینی. هەموو شتێکت بەسەرهات، بەڵام

یەک هەنگاویش نەهاتیتە دواوە. تۆ بە چەرخی فەلەکدا تیپەڕیت. سنگت کردبووە قەڵغانی ئەم هەموو خەمە و سەرکەوتووبیت. نە لە دۆڕان نە لە کەوتن و ڕووخان نەترسایت، ئێستا لەوە دەترسیت سەر لە نوێ دەست پێبکەیتەوە؟

**”مەترسە، ناوی خودا بهێنە و بەڕێکەوە، دڵت ئامانەتی خودا بکە، خودا لە خێر نزیکت دەکاتەوە و بێخێرەکان لە ژیانت بەدوور دەگرێت“**

ئەی گیان!

هەزار دەرمانت هەبێت

هەزار و یەک دەردت هەیە تۆ.

گەر چواردەورت پڕبێت لە دڵخۆشی

تۆ هەر گلەیی دەکەیت.

ئەی گیان!

گەر هەموو کەس چۆکت بۆ دابدات

تۆ کێبرکێی نەبڕاوەت هەیە.

گەر هەموو موڵکی سولەیمان پاشات پێبدەن

تۆ هەر نەفست تێر نابێت.

ئەی گیان!

گەر عەشق لەبەر پێت ڕابخەن

تۆ دڵت هەر کوێرە.

گەر دڵێکی نەمرت پێببەخشن

تۆ هەر سپڵەیت.

ئەی گیان!

چۆن دەژیت بژی

تۆ ژیانێکی سەختت هەیە.

کە مردیت و تەرازووەکەت کەوتە کار

تاقیکردنەوەیەکی گەورەت هەیە.

## ئومێدت لەدەست مەدە،
## دەزانیت ئومێد چییە؟

ئومێد ئەوەیە کاتێک دەبینیت خۆر ئاوا دەبێت بزانیت خۆر هەڵدێتەوە، ئومێد ئەوەیە بە ڕێگای تاریکیدا بڕۆیت و دڵنیابیت کۆتایی ڕێگاکە ڕووناکییە، ئەگەر تۆش باوەڕت بە ئومێد هەبێت، ڕۆژێک خۆر بە ڕووی تۆشدا هەڵدێت و ژیانی تۆش ڕووناک دەکاتەوە.

ئومێدت لەدەست مەدە!

لە یادت بێت، گەر کەسێک هەبێت لەم ژیانەدا بخوازێت تۆ نوقمی زەوی بکات و داتبەزێنێت، کەسانێکیش هەن دەخوازن تۆ بەرزبکەنەوە. گەر کەسانێک هەبن گرنگی بە خەمباری تۆ نەدەن کەسانێکیش هەن هەوڵدەدەن چیان لەدەستبێت بۆت بکەن بۆ دڵخۆشبوونت. گەر کەسانێک هەبن ژیانی تۆیان لەلا بێنرخ بێت، کەسانێکیش هەن ژیانی خۆیانت پێدەبەخشن.

لە ڕابردوودا هەرچەند هەڵەت کردبێت، هەرچەند بوونە هۆکاری برینداربوونت، هەرگیز دەربارەی داهاتووت بێئومێد مەبە. ئەوە بزانە ئەمڕۆ ئومێدە بۆ ئەو کەسانەی لە دوێنێ بێئومێد بوون. ئەوان بە ئەمڕۆ گەیشتن. چونکە بێگومان ئەم ڕۆژە ڕەشانە تێدەپەڕن. وە ڕۆژە پڕ ئومێدەکان دێن.

”داهاتووی جوان بەدوای ئەزموونی
زۆردا دێت، لەوانەیە ئازارکێشان ڕابردووت
نەگۆڕێت. بەڵام دەتوانێت داهاتووت
بگۆڕێت“

## من بە باوەڕەکانی خۆم دەژیم...

بەهۆی بێدەنگییەکەمەوە زۆر شتم لەدەست داوە، بە هۆی ئەوەی لە پلە و کوالێتی خۆم دابەزاندووە زۆر زیانم بەرکەوتووە. بەڵام لە هەمووی زیاتر بەهۆی نیازە پاکەکانمەوە زیانم پێگەیشتووە. ڕاستگۆییەکەم هەرگیز ڕێگەی نەداوە خەڵکی بخەڵەتێنم. میهرەبانییەکەم ڕێگای نەداوە خراپە بەرامبەر کەس بکەم. ویژدانم هەرگیز ڕێگای نەداوە کەس لە نیوەی ڕێگا بەجێبهێڵم. شەیتان چەند هەلی بۆ ڕەخساندبم باوەڕەکەمم لەدەست نەداوە. هەرچیم بەسەر هاتبێت نەبووەتە هۆی ئەوەی گلەیی بکەم، بەڵکو زیاتر ئارامم گرتووە و گووتومە؛ خودا دەزانێت چی باشە.

هەرگیز ماستاوچێتیم بۆ هیچ کەسێک نەکردووە گەر زیانی زۆریشی لێدابم. هەرگیز هیچ کەسێکم هەڵنەخەڵەتاندووە و لە پشتەوە باسی کەسم نەکردووە و بوختانم بۆ کەس نەکردووە. بەپێی ویستی کەس نەژیاوم، خۆم باوەڕم بە چی هەبووبێ بەپێی ئەوە ژیاوم. بۆیە زۆر کەس زوڵمی لێکردووم. بەڵام من هەمیشە لەوە ترساوم زوڵم لە خەڵکی بکەم. کە سەیری ئەو شتانە دەکەم لەدەستم داون، دەبینم بەهۆی نیەتی پاکمەوە لەدەستمداون، بەڵام هەرگیز نییەتە پاکەکەم لەدەست نەداوە. کاتم لەدەست داوە، بەڵام باوەڕمم لە دەست نەداوە. ئەمەکمم لەدەستچووە، بەڵام ئەدەبمم

لەدەست نەداوە. کەسە درۆزن و بەرژەوەندیخوازەکانم لەدەستدا، بەڵام کەسە ڕاست و باشەکانم لە دەستنەداوە. سوپاس بۆ خودا.

نازانم چەندی دیکە دەژیم، بەڵام ئەو ژیانەی کە ماومە هەر بەم جۆرە بەردەوام دەبم.

## تۆ...

من؛
لە لێواری ژیان
لە دەرگای جەهەننەم
لە ناو ئاگر
چاوەڕوانی مردنم،
لە نیوەی تەمەنم.
تۆ؛
لە هاوارە بێدەنگەکانمدایت
وەک ئەجەل لە لای ڕاستمەوەیت
وەک چەقۆ لە گیانمدایت
وەک ژەهر لە خوێنمدایت...
تۆی مەحاڵ
نە لەلامیت
نە لەلام دەبیت.

**"من بەڵێنێک بووم درابووم بە تۆ، بەڵام نەتتوانی بمپارێزیت"**

## تەرازووەکەم گۆڕی،
## هەمیشە هەوڵمداوە نێوانم لەگەڵ خەڵکی باشبێت...

هەتا ئەم ڕۆژە جیاکاریم لە نێوان کەسی باش و خراپ نەکردووە و لەگەڵ هەموو کەسێک بە باشی مامەڵەم کردووە. گەر کەسی بەرامبەر شایەنیشی بووبێت هەرگیز خراپەم بەرامبەر نەکردووە. لە کەس تووڕەنەبووم، سوکایەتیم بە کەس نەکردووە. گەر خەڵکی بەرامبەر من ڕقیشی هەڵگرتبێت من هەرگیز کینم لە دڵم هەڵنەگرتووە. گەر خراپەشم بەرامبەر کرابێت هەمیشە بێدەنگبووم.

بەڵێ، زۆر جار خەیاڵەکانم تێکشکاون، چەندین جار خەڵەتێندرام و خیانەتم لێکرا، زیاد لە پێویست خەمم خوارد. باجی چەندین هەڵەم دا کە من نەمکردبوون. بەڵام کە سەیرم کرد مرۆڤەکان هەرگیز تێرنابن، هەمیشە زیاتریان دەوێت. کاتێک کاریان بە من دەبێت نزیک دەبنەوە، بەڵام کە من پێویستم پێیان دەبێت لە جێی خۆیان جوڵە ناکەن. کە زیاتر خەڵکم ناسی تێگەیشتم مرۆڤەکان هەرگیز ناگۆڕێن. کاتم لە کەسانێکدا بە فیڕۆ دا کە شایەنی نەبوون، دواتر زانیم زۆر کەسی باشم لەدەستداوە. دواتر بڕیارمدا بۆ ئەوەی ژیانم ڕێکبخەمەوە تەرازووەکەم بگۆڕم.

وەلحاسڵ، هەرگیز ئەو کەسانە لەبیرناکەم کە ئازاریان دابووم، وە هەرگیز ئەوانەش لەیاد ناکەم کە لەلامبوون لە کاتە سەختەکانمدا. ئیتر ئومێدەکانم بۆ هیچ کەسێک بە هەدەر نادەم. لەمەودوا کێ شایەنی چیبێت ئەوەی لەگەڵ دەکەم.

## تۆ هیچ چاوەڕوانی کەسێک بوویت کە دەزانیت نایەت؟

تۆ هیچ چاوەڕونی هاتنی ڕۆیشتوویەک بوویت کە دەزانیت نایەت؟ من کردوومە! دەزانیت چۆنە؛ بۆ ئەوەی ئومێدت لەدەست نەدەیت بەردەوام خۆت دەخەڵەتێنیت. خۆت هەوڵ دەدەیت ئەوبرینانەت سارێژ بکەیت کە بۆت دروستبوون. ڕاستییەکان هێندە بە ئازار دەبن ناچار دەبیت باوەش بە درۆکاندا بکەیت. ئاخر دەکرێت مرۆڤ باوەڕ بە درۆی خۆی بکات. بەڵێ گەر زۆر خۆشتبوێت دەیکەیت!

هەر نامەیەک و زەنگێک تەنانەت دەنگی هەر دەرگایەک و هەر هەناسەیەک ئومێدت دەهەژێنێت. بە جۆرێک ئومێدەکانت بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان. هەیەجان دەتگرێت و بە خۆت دەڵێیت ئاخۆ ئەوبێت؟ بەڵام نە نامەکە و نە زەنگی دەرگاکە ئەوە. وە هەرگیزیش ئەو نابێت. بیربکەرەوە چەندین جار خەیاڵەکانت تێکدەشکێنن و تۆش ناتوانیت هیچ بکەیت.

تۆ هیچ چاوەڕوانی کەسبوویت؟ من بووم .! فریای خەمەکانت ناکەویت. هەر چرکەیەک کە تێدەپەڕێت وەک چەقۆ باوەڕت پارچە

## تۆ هیچ چاوەڕوانی کەسێک بوویت کە دەزانیت نایەت؟

تۆ هیچ چاوەڕونی هاتنی ڕۆیشتوویەک بوویت کە دەزانیت نایەت؟ من کردوومە! دەزانیت چۆنە؛ بۆ ئەوەی ئومێدت لەدەست نەدەیت بەردەوام خۆت دەخەڵەتێنیت. خۆت هەوڵ دەدەیت ئەوبرینانەت سارێژ بکەیت کە بۆت دروستبوون. ڕاستییەکان هێندە بە ئازار دەبن ناچار دەبیت باوەش بە درۆکاندا بکەیت. ئاخر دەکرێت مرۆڤ باوەڕ بە درۆی خۆی بکات. بەڵی گەر زۆر خۆشتبوێت دەیکەیت!

هەر نامەیەک و زەنگێک تەنانەت دەنگی هەر دەرگایەک و هەر هەناسەیەک ئومێدت دەهەژێنێت. بە جۆرێک ئومێدەکانت بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان. هەیەجان دەتگرێت و بە خۆت دەڵێیت ئاخۆ ئەوبێت؟ بەڵام نە نامەکە و نە زەنگی دەرگاکە ئەوە. وە هەرگیزیش ئەو نابێت. بیربکەرەوە چەندین جار خەیاڵەکانت تێکدەشکێنن و تۆش ناتوانیت هیچ بکەیت.

تۆ هیچ چاوەڕوانی کەسبوویت؟ من بووم .! فریای خەمەکانت ناکەویت. هەر چرکەیەک کە تێدەپەڕێت وەک چەقۆ باوەڕت پارچە

پارچە دەکات. وە تۆش بە بێچارەیی سەیری مردنت دەکەیت. لەوە خراپتر دەزانیت تێناپەڕێت و دەتەوێت خۆت بخەڵەتێنیت و بە خۆت دەڵێیت تێدەپەڕێت. وەک چۆن دەزانیت نایەت و چاوەڕوانی دەکەیت.

## دەتەوێت دڵخۆشبیت؟

هەموو کەسێک حەز دەکات دڵخۆشبێت، بۆیە زۆربەی کەس نیوەی تەمەنی بە هەوڵدان بۆ دڵخۆشبوون بەسەر دەبات. بەهۆی ئەوەی عاشقبوون باشترین ڕێگایە بۆ دڵخۆشبون زۆربەی کەس بۆ عەشق دەگەڕێت. بەڵام هەموو عەشقێک دڵخۆشی ناهێنێت. چونکە هەمو کەس وەک یەک نییە. تێڕوانینی هەموو کەسێک وەک یەک نییە بۆ دڵخۆشبوون. جۆری ژیانکردنی هەموو کەس لەیەکدی جیاوازە. ئەگەر ژیان و هەستەکانتان لەگەڵ کەسێکی گونجاو هاوبەشی پێنەکەن ئەو پەیوەندییە لەدڵخۆشی زیاتر ئازارتان بۆ دێنێت. لە یادی مەکەن دڵخۆشی بۆ کەسانێکە کە مەرجەکانیان بۆ دڵخۆشبوون وەک یەکبێت. کەسانێک ژیانکردن و تێگەیشتنیان جیاوازبێت لە یەکدی زۆر سەختە پێکەوە دڵخۆشببن. گەر مرۆڤ چاوەڕوانییەکانی گەورەبێت سەختتر دڵخۆش دەبێت. زۆر گرنگە بزانیت چیت لە دڵخۆشی دەوێت، نەک دڵخۆشی چی لە تۆ دەوێت. بۆ نموونە؛ گەر کەسی بەرامبەرتان ڕەشبێت ڕەنگاوڕەنگبوونی ئێوە هیچ سودێکی نابێت. گەر کەسی بەرامبەت چەقەڵبێت ئاسک بوونی تۆ هیچ سودێکی بۆ تۆ نییە. بەڵام گەر

خۆت لە کەسی بەرامبەردا ببینیتەوە و وەک خۆت گرنگیت پێبدات و خۆشی بوێیت ئەو کاتە دەتوانیت دڵخۆش ببیت. پێشنیارم بۆت ئەوەیە؛ گەر دەتەوێت دڵخۆشببیت کەسێک هەڵبژێرە لە ئاستی خۆتبێت.

**"گەر هێندەی دڵخۆشت دەکەن دڵخۆشکرابیت**
**کەس لە تۆ دڵخۆشتر نییە"**

## لە کۆتاییدا
## ویستمان دڵخۆشبین...

ویستمان خۆشمانبوێن، خۆشیانبوێین، بیریان بکەین و بیرمان بکەن، بە کورتی ویستمان لە جوانی عەشقدا ونببین. عەشق بەلای ئێمەوە زۆر پیرۆزبوو، چونکە ئێمە کەسانێکین باوەڕمان زۆر بە عەشق هەیە. ئێمە هەرچی بکەین ناتوانین ئەم بۆشاییە بەبێ بوونی عەشق پڕبکەینەوە. تەنیابووین، هەستمان بە کەمی دەکرد. ویستمان کەسێک نیوەکەی دیمان تەواو بکات.

ڕۆژێک کەسێک هاتە ژیانمانەوە، وامانزانی ئەو شتانەی دەمانەوێت تێیدا بژین لەلای ئەو هەیە. بە هەیەجانەوە خۆشمانویستن، وامانزانی هێندەی خۆشمان دەوێن خۆشیان دەوێین. وامانزانی هێندەی بیریان دەکەین بیرمان دەکەن، بەڵام بە هەڵەداچووین. سەرکەوتوونەبووین. نەمانتوانی دڵخۆشبین.

چونکە لە جیاتی ئەوەی لە سەرەتاوە دەستپێبکەینەوە لە کۆتاییەوە دەستمان پێدەکردەوە، کەسێک هاتە ژیانمان و گووتمان ئەمە کۆتاییە. هەڵەیان بەرامبەر کردین، وامانزانی دەگۆڕێن. لە جیاتی ئەوەی لێیان دووربکەوینەوە چانسی دیکەمان پێدان. ئەو

ڕێگایانەی دەمانویست تا کۆتایی بڕۆین نەمانتوانی بە نیوەشی بگەین. دواتر ئەقڵمان هاتەوە سەر خۆمان. بەڵام خەم بەرۆکی گرتین...

لە کۆتاییدا، ڕیمان لە کەسانێک نەکەوت قەدری عەشق بزانن، کاتێک دەمانویست کەسانێک دڵخۆشبکەین خۆمان خەمباربووین. نەمانتوانی ڕێگا دروستەکە بدۆزینەوە.

لە مەودوا ئەو کەسەی کە منی دەوێت دەبێت قبوڵی ماندوێتی و شکاوی من بکات، دەبێت بتوانێت ئـەوانـەم بـۆ بگـەڕێنێتـەوە کـە لە دەستم داوە، بۆ نموونە؛ بـاوەڕ و متمانەم ...

## ژیانێکی نوێ یان لەناوچوون؟
## خۆت نوێ بکەوە...

بە نیازیت چەندیتر بە گریان و خەمخواردن ژیانت بەڕێ بکەیت؟ چەندیتر زیان بەو دڵە پاکەت دەگەیەنیت؟ چەندیتر چاوەڕوانی کەسێک دەکەیت کە ناگەڕێتەوە؟ ئاگادارنیت کاتیش لەگەڵ فرمێسکەکانت دەڕوات؟ تۆ لەبەر هیچ خەریکە هەموو شتێکت لەدەست دەدەیت... لە یادت بێت لەم دونیایە هەموو شتێک مومکینە. مومکینە لەسەرەتاوە دەستبکەیتەوە بە ژیانکردن، و مومکینە لەگەڵ ئازارەکانت بمریت. ئێستا دوو هەڵبژاردەت لەبەردەمە؛ یان دادەنیشیت و بەردەوامدەبیت لە گریان، یانیش هەوڵ دەدەیت و دەست دەکەیت بە جەنگین هەتا هەموو شت باشدەبێتەوە. ئەگەر گریانەکە هەڵبژێریت هیچ شتێک باش نابێتەوە و خۆت ناخی خۆت دەخۆیتەوە. ئەگەر جەنگین هەڵبژێریت دەست دەکەیت بە ژیانێکی نوێ و بەرەو سەرکەوتن دەڕۆیت، بڕیار بەدەست تۆیە.

**"هەرگیز مەڵێ مەحاڵە، خۆت بچوک مەکەرەوە، چونکە دەتوانیت سەرکەوتووبیت"**

## قەدەرە یان بڕیاردانی خۆمانە؟

لەم ژیانەدا هەرچیت پێبەخشراوە قەدەرتە، وە هەرچی قەدەرتە هی تۆیە. بەڵام کاردانەوەی تۆ بۆ قەدەرت هەڵبژاردەی خۆتە. بۆ نمونە؛ خۆشویستنی کەسێک قەدەری تۆیە، بەڵام خیانەتکردن لێی و خەڵەتاندنی بڕیاری خۆتە، مردن قەدەری تۆیە، بەڵام ئەوەی کە تا مردن لە کوێ بژیت بڕیاری خۆتە. لە بیرت بێت دەتوانیت بە بڕیاری خۆت قەدەرت جوانتر بکەیت یان ناشرینی بکەیت. ئەمە بە تەواوی بەدەست خۆتە. بۆیە دەبێت زۆر بە وردی بیر لە هەڵبژاردەکانت بکەیتەوە و بزانیت چۆن بڕیار دەدەیت.

دەتەوێت قەدەرت جوانتر بکەیت؟ گەر دەتەوێت هەوڵبدە. گەر کەوتویت هەستەوە، مەڵێ قەدەرە و وازبێنیت. ڕێگا مەدە ئەو بەربەستانەی دێنە بەردەمت بتخەن. لەو ڕێگانەی کە هەتا نیوەی هاتوویت مەڵێ قەدەری من نییە و بگەڕێیتەوە .هەتا پێینەگەیت کۆڵ مەدە. بە هەڵبژاردەکانت پشت لە قەدەر مەکە و لە ژیان مەتۆرێ. لە یادت بێت، ئەوانەی کە تاقیت نەکردوونەتەوە و ئەوانەی کە وازتلێهێناون بەهۆی بڕیاری خۆت بووە. ئەوانەشی کە هەوڵت بۆ داوە و تاقیتکردوونەتەوە قەدەری تۆن.

**"با دڵت پاکبێت هەتا قەدەریشت پاکبێت،**
**ئاگات لە دڵت بێت با دڵیشت ئاگای لێتبێت"**

## تاکە شت کە دڵنەوایی نییە...

کاتێک کەسێک ئازاری پێگەیشت، دەتوانیت دڵنەوایی بکەیت. کاتێک کەسێک بەجێ دەهێڵرێت دەتوانیت دڵنەوایی بکەیت. کاتێک کەسێک لەدەست دەدەن دەتوانرێت دڵنەوایی بکرێت. بۆ هەموو شتێک دڵنەوایی هەیە لەم دونیایەدا. تەنها یەک شت نەبێت! کاتێک کەسێک دەڕوات دەڵێین خێری تێدایە. کاتێک دەڕوخێن دەڵێین تاقیکردنەوەیە تێدەپەڕێت. دەڵێن کەوتم، دەڵێین بێگومان کەسێک دێت و دەستت دەگرێت. کاتێک دەڵێن دەمرم، دەڵێین خودا گەورەیە تۆش چاکدەکاتەوە. بەڵام کاتێک دەڵێن بیری دەکەین لەوێدا هیچمان پێناگوترێت. چونکە هیچ قسەیەک دڵنەوایی کەسێک ناکات کە بیری یاری دەکات. هیچ وەڵامێک لە ئازاری ئەو کەم ناکاتەوە. داوای هاوکاری لە هەرکەس بکەیت ناتوانێت هیچت پێبڵێت.

## لەدەستتدا...

لەدەستتدا، چونکە بـەردەوام هەوڵتدا چاکی بکەیت، خۆت خەڵەتاند بەوەی کە خۆشی دەوێیت. واتزانی چیتر هەڵەت بەرامبەر ناکات و بەردەوام چانسی دیکەت پێدا. لەکاتێکدا نییەتی پاکی تۆی بەکاردەهێنا بەردەوامبوویت لەسەر نیازپاکیت. لەدەستتدا، چونکە کاتێک پێیاندەگوتیت وازی لێبهێنە تۆ پارێزگاریت لێدەکرد. ئەو کەسانەت لە خۆت دورخستەوە کە دەیانویست تۆ بپارێزن. هەموو شتێک ڕوون و ئاشکرابوو، بەڵام تۆ خۆت لە گێلی دەدا. هەر کاتێک ئەو دەیخەڵەتاندیت و دەیگریاندیت تۆ لە جیاتی ئەوەی کۆتایی پێ بهێنیت بۆ بەهانە دەگەڕایت هەتا لێی ببوریت. لەدەستتدا، چونکە کاتێک ئەو هیچی بۆ تۆ نەدەکرد تۆ وازت لە هەموو شت هێنا بۆی. کاتێک ئەو درۆی لەگەڵ دەکردیت بە ویستی خۆت بڕوات پێدەکرد. کاتێک ئەو هیچ گرنگی نە دەدا بە خەم و ئازارەکانت تۆ هەوڵتدەدا دڵخۆشی بکەیت. ئەوت زیاد لە پێویست گەورە کرد. کاتێک ڕۆیشت و تەنانەت ئاوڕیشی لێنەدایەوە تۆ بەردەوام چاوەڕێتکرد. لەدەستتدا، چونکە زیاد لە پێویست خۆشتویست و هەوڵتدا، وە زیاد لە پێویست نییەتت پاکبوو.

## بەهانەکان، هەڵەکان، وە درۆکان...

هەردووکمان بەهانەمان هەبوو، هەردوکمان هەڵەمانکرد، وە هەردوکیشمان درۆمان کرد. وە هەردووکمان شایەنی ئەم کۆتاییە بووین. بەڵام یەک جیاوازی هەیە هەڵەکانی من و هەڵەکانی تۆ جیاوازی هەیە.

ڕاستە هەردووکمان هەڵەمان هەبوو، من لە کاتێکدا دەمزانی تۆ منت خۆشناوێت بەردەوام بووم لە خۆشویستنت، تۆش ڕێگەتدا کەسێکت لە دەست بچێت کە تۆی خۆشدەوێت و هیچ هەوڵت نەدا خۆشتبوێت. من کە دەشمزانی ئێمە نابینە یەک هەر بەردەوام بووم لە خۆشویستنت. وە تۆش هیچ هەوڵێکت نەدا. هەردووکمان بەهانەمان هەبوو. بەهانەکانی من بۆ گەیشتن بوو بە تۆ و بەهانەکانی تۆش بۆ ڕۆیشتن بوو لە من.

من بەهانەی زیاترم دەهێنایەوە بۆ ئەوەی زیاتر لەلاتبم، وە تۆش بەهانەی زیاترت هێنایەوە هەتا بڕۆیت. هەردووکمان درۆمان دەکرد، درۆکانی من بۆ ئەوەبوون کە زیاتر خۆشم بوێیت و درۆکانی تۆش بۆ ئەوەبوون وا دەربکەویت خۆشت دەوێم. تۆ درۆت دەکرد بۆ ئەوەی وازبهێنم و منیش درۆم دەکرد بۆ ئەوەی لەدەستت نەدەم. ڕاستە هەردووکمان تاوانبارین. تۆ تاوانباریت کە منت خەڵەتاند و منیش تاوانبارم کە باوەڕم پێتکرد.

**”تێبینی؛ ئەگەر لە پەیوەندییەکدا درۆکان لە ڕاستییەکان زۆرتربن، و بەهانەکان لە هەوڵەکان زیاتربن، ئەو پەیوەندییە دەمێکە کۆتایی پێهاتووە“**

**وەک کەسێک کە بەم ڕێگایەدا ڕۆیشتووە**
**دەتوانم ئەوەت پێبڵێم؛**
**نەکەیت بکەویت، چونکە گەر کەوتیت جارێکی**
**دیکە ناخوازیت هەستیتەوە**

## ئامۆژگارییەکان...

هەرچیت بەسەردێت با بێت، بەڵام هەرگیز ئەوە بەسەر کەسێک مەهێنە کە ناخوازیت بەسەرتبێت.. بۆ کوێ دەڕۆیت برۆ، بەڵام هەرگیز ئەو دەرگایە بەسەر کەس دامەخە کە ناخوازیت بە ڕووتدا دابخرێت. ئەنجامی هەرچیبێت هەرگیز واز لە ڕاستگۆیی مەهێنە. هەرچی دەکەیت بیکە، بەڵام ئاهی کەس مەخە گەردنت. هەرچی دەکەیت بیکە، بەڵام خیانەت لە کەس مەکە. لە هەرچی دوادەکەویت بکەوە، بەڵام بۆ خۆشویستنی کەسێک دوامەکەوە. لە یادی مەکە لەم دونیایەدا سێ شت زۆر بە نرخە؛ "هەستەکان، کات، خۆت". ئەم سێ شتە هەرگیز لە کەسانێکدا بە هەدەر مەدە کە شایەنی نییە، چونکە دەبێت بزانیت گەر ئەمانەت لەدەستدا هەرگیز ناتوانیت بەدەستیان بهێنیتەوە.

## ئارامبگرە...

ڕۆژی لێپرسینەوە لەو کەسانەی ئازاریان داویت نزیکە، ئارامبگرە. ئەوانەی تۆیان گریاند دەگرینەوە. ئارامبگرە، ئەو کەسانەی تۆیان لە نیوەی ڕێگا بەجێهێشت دەکەونە سەر پێیەکانت. ئارامبگرە، ئەو کەسانەی بوختانیان بۆ کردیت بۆیان دەکرێتەوە. ئارامبگرە، ئەو کەسانەی تۆیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکار دەهێنا بەم نزیکانە سزای خۆیان وەردەگرن. ئەوانەی لە پشتەوە چاڵیان بۆ هەڵدەکەندیت دەکەونە چاڵی خۆیانەوە. ئەوانەی کە دەیانویست بتخەڵەتێنن ڕووی ڕاستییان دەردەکەوێت. تۆ پەنا بەخودا بگرە و پشتی پێببەستە، چونکە خودا بەردەوام لەگەڵتدایە ...

لە یادی مەکە؛ ئەوانەی ئەمڕۆ گرنگی بە فرمێسکەکانت نادەن، سبەی خودا موحتاجی تۆیان دەکات، ئارامبگرە!

**"ئارامبگرە! چونکە ئارامگرتن لە ڕۆژە سەختەکان دەبێتە کلیلی ڕۆژە خۆشەکان"**

## تاوانی منە!
## بەڵێ تاوانبارم!

هێندە گرنگیم پێتدا هەتا حەز و ئارەزووەکانی من هیچ گرنگییەکیان نەما لە چاوی تۆدا، هەموو شتێک بەپێی ویستی تۆ بوو، کاتێک تۆ لەلای من بە نرخ دەبوویت من لەلای تۆ بێنرختر دەبووم. دەتزانی هێندەم خۆشدەوێیت هەرچی بکەیت دەتبوورم. وە تۆ بەهۆی ئەمەوە هەستت بە ئازادی کرد و زیاتر ئازارتدەدام. یەکێکی دیکە لە کێشە سەرەکییەکان ئەوەبوو کە من زۆر بە ویژدان و نیازپاک بووم. زۆر ئازاردرام بەڵام ئازاری کەسم نەدا. دڵم پارچە پارچەبوو، بەڵام هیچ قسەیەکی خراپم نەگوت. گریام بەڵام وازم لەوە نەهێنا بتخەمە پێکەنین. هەندێک ڕۆژ تووڕەدەبووم لێت، بەڵام هەموو دڵشکانەکانم لەیاد دەکرد و دەهاتم بۆلات. کاتێک پێویستم پێتە لەلاشم نەبیت من هەر لەلات دەبم، گەر تۆ پێویستت بە من بێت. دەزانم کە تاوانی منە! زیاد لە پێویست گەورەم کردیت. ئەگەر من هێندە بە ویژدان نەبوومایە تۆ هێندە بێویژدان نەدەبوویت.

## دڵۆپ دڵۆپ لەیادکردن...

گەر کەسێک گرنگیت پێبدات و خۆشیبوێیت و هەموو شتێکت لە پێناو بکات، هەرگیز هەڵەی بەرامبەر مەکە. دەیشکێنیت و خەمباری دەکەیت، دوایی بوێری ئەوەشت نابێت بیریشی بکەیت. شکاندنی دڵی من چ سودێکت پێدەگەیەنێت نازانم، بەڵام حەزدەکەم بزانیت زۆر شتت لە دڵی من لەدەستدا. هێندە لەخۆبایی و بێمنەت بوویت هەرگیز هەستت بەوە نەکرد من چۆن دڵۆپ دڵۆپ خەمم لێدەتکا. کە لەلام نەدەبوویت و گرنگیت پێنەدەدام هێواش هێواش منت لەدەستدا. وە لە کۆتاییدا وات لە دڵێک کرد کە خۆشی دەویستی هەرگیز بیرت نەکات. هیچ کەسێک بە ئاسانی لەبیرناکرێت. گەر تۆش هەوڵت بۆ خۆشویستنی من بدایە و لە جیاتی ئەوەی هەستەکانی من بەکاربهێنیت تۆش گرنگیت پێبدامایە دەمتوانی تا کۆتایی تەمەنم خۆشمبوێیت. بەڵام تۆ خۆت لە پشت خۆشەویستی من شاردەوە و واتزانی تا کۆتایی تەمەنم خۆشم دەوێیت. هەڵەتکرد!

بەڵێ خۆشمویستی، دڵم پڕبوو لە تۆ. بەڵام کردەوەکانت و هەڵسوکەوتەکانت درزی کردە دڵم... لەبەر ئەم هۆیە تێکەڵ بە خوێنم بوویت. لە خوێنمەوە بۆ بەدەنم و لە بەدەنمەوە بۆ پێستم و لە پێستمەوە بۆ دەرەوە ... بەم جۆرە دڵۆپ دڵۆپ لە یادت دەکەم.

”ئەگەر كەسێك بڕیاری
لەبیركردنی كەسێكی دابێت،
یان خۆشنەویستراوە، یانیش
خۆشەویستییەكەی بەكارهێنراوە“

## گەرنا، دیسان ئێوە خەمباردەبن...

مرۆڤەکان بۆ ئەوەی ئێوە بخەڵەتێنن دەچنە هەموو قالبێکەوە، دەتوانن زۆر بە باشی دەور ببینن، هەتا لەبەر چاوی ئێوە پاک دەربکەون. هەموو شتێک دەکەن لە پێناو ویست و بەرژەوەندییەکانی خۆیان. ئەگەر زوو کەسایەتی ڕاستەقینەیان نەبینن زۆر ویرانتان دەکەن. زۆر ئاگاداربن! ڕێ بۆ هەموو کەسێک خۆش مەکەن کە بە ڕوتاندا پێدەکەنن. وامەزانن هەرکەسێک کە لێتان نزیک دەبێتەوە وەک خۆتان دڵپاکە. لە هەموو دەرگایەک مەچنە ژوورەوە کە بە ڕوتاندا دەکرێتەوە. بۆ ئەوەی دوایی زۆر خەمبار نەبن ئاگاداری دووری و نزیکیتان بن لەگەڵ خەڵکی... کەمێک دڵخۆشبونتان ئاسان بکەن. بە دوای شتی مەحاڵ مەکەون.

لە جیاتی ئەوەی دوای کەسانێک بکەون کە گومانتان لە خۆشەویستیان هەیە، دوای کەسانێک بکەون کە دڵنیان خۆشیان دەوێن. بەدوای شتانێک مەکەون کە نابن. لە یادی مەکەن؛ عەشق بارێکی زۆر گەورەیە. ئەو بارە تەنها بە یەک دڵ هەڵناگیرێت. پێشنیارم بۆتان ئەوەیە کە یان هیچ مەچنە ژێر باری، یان دڵێک بدۆزنەوە ئەو بارەتان لەگەڵ هەڵبگرێت. گەر نا دیسان ئێوە خەمبار دەبن.

## دەتزانی؟

خۆشویستن حەڵاڵە، خۆشویستران حەرامە
بیرکردن موباحە، بیرکران گوناحە
ڕاستگۆیی ژیانە، خیانەت مردنە

## بێئومێدمەبە...

ئەگەر ڕۆژێـک هەستت کـرد مـاندوویت، ئەگـەر هەستت کرد سەرکەوتوونابیت، ئەگەر هەستت کرد بە کۆتایی ڕێگاکە گەیشتوویت، زیاتر یادی خودا بکە. چونکە خودا هەرگیز بارێک نادات بە کەسێک کە بزانێت ناتوانێت هەڵیبگرێت. بزانە کە تۆ بە کۆتایی ڕێگاکە گەیشتیت خودا سەرەتای ڕێگایەکی نوێی بۆت داناوە. بێگومان ڕۆژێک قەدەری خۆت خۆشدەوێت. تەنها تۆ واز لە ڕەشبینی بهێنە. بە باوەڕ و ئارامییەوە لە ڕێگاکەت بەردەوامبە.

ئەو خودایەی کە دەتوانێت ڕزقی هەموو بوونەوەران بدات، دەتوانێت دەرمانی دەردی تۆش بدات، لە یادت نەچێت. هەرگیز بەو دەنگە ڕەشبینەی ناو ناخت نەخەڵەتێیت کە دەیەوێت تۆ بڕزێنێت و لەناوتبەرێت. متمانەت بە خودا هەبێت و بەردەوامبە لە نزاکردن و هەرگیز خۆت بە تەنیا مەزانە. خەمباربە، ماندووبە، بێتاقەتبە، بشکێ، تەنانەت هەرچی دەبی ببە، بەڵام هەرگیز بێئومێد مەبە.

**"بێئومێد مەبە، ژیان تەنها ناخۆشی نییە، ئارامبگرە، ئەو شتانەی خەیاڵت کردووە بێگومان ڕۆژێک دەبێتە ڕاستی"**

## تۆ بێنرخ نیت!

## ژیان بەم جۆرەیە، نەزانراوە...

دەکرێت هەندێک جار کەسانی هەڵە بێنە بەرامبەرت، هەندێک جار دەکرێت هەست بە نرخی خۆت نەکەیت. دەکرێت زۆر جار هەڵەش بکەیت. بەڵام هیچ کام لەمانە بە مانای ئەوە نایەت کە تۆ کەسێکی خراپیت، یان بێنرخیت. خەم مەخۆ! تۆ بێنرخ نیت! تەنها ڕێت لە کەسێک کەوتووە کە نرخت نازانێت. نەکەیت واز لە ژیانکردن بهێنیت. هەرگیز بێ ئومێد نەبیت. بێگومان ڕۆژێک ڕێت لە کەسێک دەکەوێت کە نرخت بزانێت...

گەر لەم دونیایە کەسانێک هەبن لە ژیان ساردت بکەنەوە، کەسانێکیش هەن حەز دەکەن بتگەڕێننەوە بۆ ژیان. گەر کەسانێک هەبن پشتت لێبکەن، کەسانێکیش هەن ڕێگە نەدەن زیان بە تاڵی قژت بگات. بزانە ژیان تاقیکردنەوەیەکە. ئەوەی کە بەهۆی کەسێکی بێنرخەوە ڕووی گرژ دەبێت، ڕۆژێک بەهۆی کەسێکی بە نرخیشەوە ڕووی دەگەشێتەوە. ئەمە لە یاد مەکە؛ ئەو کەسانەی کە تۆیان خەمبار دەکرد ڕۆژێک خۆشیان خەمبار دەبنەوە. بێگومان ئەوانیش وەک ئەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت کە کردوویانە. گەر لە عەشقدا دادپەروەری نەبێت بێگومان لە عەرشدا دادپەروەری هەیە...

**"متمانە بە خودا بکە! هەموو ئەوانە بە خودا بسپێرە کە یاریان پێکردیت. بێگومان ڕۆژێک ئەوانە بەدەستدەهێنیتەوە کە لەدەستت داون"**

## هەمووی تێدەپەڕێت..

تێدەپەڕێت، تۆ ناخەڵەتێنم و هەرگیز هەوڵیش نادەم بتخەڵەتێنم، بەڵام هەمووی تێدەپەڕێت. دەزانیت چۆن دەزانم؟

تێدەپەڕێت! تۆ چەند هەستیشی پێنەکەیت ژیان لەگەڵ تۆیە، کات لەگەڵ تۆیە و باوەڕیش لەگەڵ تۆیە. خودا لەگەڵتە... ڕاستییەکەی هەرچیت پێویستبێت لەگەڵتە. ئێستا هەرچەند خەم بخۆیت و ڕابردووت قبوڵنەکەیت و وابزانیت ژیانت چاکنابێتەوە ڕۆژێک ژیان دیسان دەستت دەگرێتەوە. ئەگەر زۆر ماندووشببیت و بەرگەی ڕوداوەکانی ژیانت نەگریت تەنانەت گەر وازیش بهێنیت باوەڕەکەت ڕۆژێک هێزت پێدەداتەوە. کات هەموو کەس و هەموو شتێکت بیردەباتەوە و خودا ژیانێکی پاک و تەمیزت پێدەبەخشێت.

وازمەهێنە، کوڵمەدە، چاکدەبیتەوە، ناخت چۆن سوتابێت ئەوها خامۆشدەبێت. چۆن کەوتبیت ئەوهاش فێردەبیت چۆن هەستیتەوە. چۆن خۆشتویستوون ئەوها خۆشدەویسترێیتەوە. بە خۆڕا ڕەشبین مەبە. ڕۆژی زۆر خۆشت دەبێت.

"بێئومێد مەبە!
ئەو خودایەی دەتوانێت دوای مردن
زیندووت بکاتەوە، ڕێگا دەدات لەم
دونیایەدا لەناوبچیت؟"

## ئاسودەیی ویژدان...

هۆکاری ئەوەی کە هەندێک کەس بە ئاسانی نارۆخێن بەهێزیان نییە، ئاسودەیی ویژدانیانە. چونکە ئەوان گەر بشگەڕێنەوە دواوە هەمان شت دەکەن. بە درێژایی ژیانیان لە هیچ شتێک پەشیمان نابنەوە کە کردوویانە. هەرچیان کردبێت بەو باوەڕەوە کردوویانە کە هەموو شتێک باشدەبێت. هەرچەند خەمباریشبووبن هەرگیز نەبوونەتە هۆکاری خەمباربوونی کەس. هەندێک کەس گەر بشدۆڕێت خەم ناخۆن. چونکە ئەوان ویژدانیان ئاسوودەیە. لە هەموو کات و ساتێک لایەنی ڕاستی دەگرن. لە هەموو ڕووداوێکدا بە دادپەروەرانە مامەڵە دەکەن. باجی هەرچی بوبێت بەردەوام ڕاستییان گوتووە. ئەنجامەکەی هەرچی بووبێت هەرگیز سەریان بۆ کەس شۆڕ نەکردووە. تەنها پشتیان بە خودا بەستووە و ڕەزامەندی ئەویان لەلا گرنگبووە.

لە یادی مەکە؛ دەتوانیت لە کەسی ئاقڵ ببەیتەوە، لە کەسێکیشی دەبەیتەوە کە لەسەر حەقە، کەسێک بەهێزیش بێت لێیدەبەیتەوە. بەڵام هەرگیز لە کەسێک نابەیتەوە کە ویژدانی ئاسودەبێت. چونکە

کەسێک ویژدانی ئاسودەبێت ئەو شتانەی بە لاوە گرنگ نییە کە لەدەستی دەدات. وە گەر کەسێک گرنگی بەو شتانە نەدات کە لەدەستی داوە بە لەدەستدان بۆی هەژمار ناکرێت...

**"ویـژدان، پردی سیراتی نێوان کردەوەکانی ڕابـردوو و داهـاتـووی کـەسێکـە. ئـەوەی لـەم دونیایە لەسەر ئەو پردە نەپەڕێتەوە لە ئاخیرەت پەڕینەوەی زۆر سەخت دەبێت"**

## ناتوانم متمانە بە کەس بکەم...

ناتوانم متمانە بە هیچ کەسێک بکەم، چونکە ئەو کەسانەی خەیاڵی داهاتووم لەگەڵ دەکردن ئێستا هیچ کامیان لەگەڵم نین. ئەو کەسانەی کە زۆر متمانەم پێیان هەبوو لە یەکەم هەل کە بۆیان هەڵکەوت پشتیان لێکردم. ئەو کەسانەی کە هەوڵم بۆ دڵخۆشکردنیان دەدا هەر کە تێربوون لە خۆباییبوون و گۆڕان. پاداشتی هەموو ئەو چاکە و هاوکاریانەی دەمکردن ڕۆیشتنیان بوو. ناتوانم متمانە بە کەس بکەم، چونکە دەرکەوت من هیچ نەبووم بۆ ئەو کەسانەی کە پێیان دەگوتم؛ تۆ هەموو شتێکمی.

ئەوانەی کە دەیانگوت؛ تا مردن خۆشم دەوێیت ئێستا لەگە خەڵکی دیکەن. ئەوانەی کە دەیانگوت؛ هیچ وازت لێناهێنم ئاسەواریشیان نەماوە. ئەوانەی دەیانگوت؛ ناتوانم بێ تۆ هەناسەبدەم ئێستا زۆر تەندروستن و هیچ کێشەیەکیان نییە.

وەلحاسڵ، من ئێستا بریندارى دەستی ئەو کەسانەم کە برینەکانیانم سارێژ کردووە. گوڵم بۆ هەرکەس بردبێت ئێستا دڕکەکانی لە دەستمدایە. هەرکاتێک متمانە بە کەسێک بکەم لە کۆتاییدا خەمبار دەبم. لەبەر ئەم هۆکارانەیە متمانە بە کەس ناکەم.

**"گەر دەتەوێت متمانە بە کەسێک بکەیت، متمانە بە خۆت بکە. چونکە هیچ کەسێک لە خۆت باشتر نابێت لەگەڵت"**

## کەسی سپڵە هەرگیز ناگۆڕێت...

هەموو کەسێک وەک خۆی قبوڵ بکەن، بەڵام مەبنە دەست و چاوی کەس. بزانن دەبێت چۆن مامەڵە لەگەڵ کێ بکەن. هێندە ڕوو مەدەن بەو کەسانەی کە شایەنی نین لە خۆیان بایی ببن. لە یادی مەکەن؛ هەرچەند زیاتر ڕوو بەکەسێک بدەن زیاتر سنووری خۆی دەبەزێنێت. کەسە هیچەکان لە خۆتان گەورە مەکەن. باوەڕیان پێمەکەن تا لە کۆتاییدا خەمتان بۆ نەمێنێتەوە. خۆشتان نەوێن و زیان بە خۆتان مەگەیەنن. گەر کەسێکتان خۆشویست؛ کەسێکتان خۆشبوێت کە شایەنی فرمێسکەکانتان بێت. بە خێرایی بڕیار لەسەر کەس مەدەن و متمانە بە هەموو کەس مەکەن. سەرەتا سەیری کەسایەتی ئەو کەسانە بکەن کە دەتانەوێت بیانناسن و بیانهێننە ژیانتان. هەرچەند پلە و پایەشیان باشبێت گەر کەسایەتیان باش نەبێت مەیانهێننە ژیانتان. گەر کەسێک خووی خراپ بوو بەرگەی بگرن. گەر کەسێک جاهیل بوو ئاقڵی بکەن. گەر کەسێک توڕەبوو ئارامبگرن، بەڵام گەر سپڵەبوو بەڕێی بکەن با بڕوات. کەسی جاهیل ئاقڵ دەبێت و کەسی توڕەش ئارام دەبێتەوە، بەڵام کەسی سپڵە هەرگیز ناگۆڕێت.

## دڵم مرد...

دڵم مرد، دەزانی دڵ مردن چییە!؟ کە من دڵم وا مردووە تۆ چۆن دەتوانیت بە ئاسودەیی بژیت؟ من کە بەم جۆرە لە ژیان دابڕاوم تۆ چۆن دەتوانیت وابەستەی ژیان بیت؟ نازانم لە نێون ئەم هەموو ئازار و نەفرەتە چۆن دەتوانم بیرت بکەم. ئێستا دەزانم چەند قوڵ خۆشمویستویت. دەتوانم قبوڵی بکەم کە ڕۆیشتویت، وە قبوڵیشمە کە منت خۆشنەویستووە. بەڵام ناتوانم قبوڵی بکەم کە یاریت پێکردووم و درۆت لەگەڵ کردووم. ئەوە کەی پیاوەتییە کەسێک بەجێبهێڵیت لە خەم و ئازاردا کە تازە باڵی خۆشبەختی گرتووە؟ تۆ چۆن دەتوانیت تێبگەیت؛ چەند سەختە ئەو کەسەی لە هەموو دونیات خۆشتر دەوێت بتبینێت ئازار دەکێشیت و هیچت پێنەڵێت! هەر خۆم دەزانم ناتوانیت تێبگەیت. بێگومان گەر ڕۆژێک کەوتیتە ئەم دۆخەی من تێدەگەیت چەند سەختە ...بۆ من تایبەتبوویت.

بە خۆشەویستی تۆم گەورە کرد، من تۆم لە خۆشم خۆشترویست. بەڵام تۆ منت لە خۆم کردە دوژمن و ڕۆیشتیت. لەبەر ئەوەی هێشتا تۆم خۆشدەوێت نەفرەت لە خۆم دەکەم! خەمباربوون لەدەست خۆمانە؟ کاتێک من لە دەوری تۆ دەگەڕ

تۆ لە دەوری بەرژەوەندییەکانت دەگەڕایت. من هاتبووم ژین لە لای تۆ بدۆزمەوە، بەڵام تۆ بوویتە قەبرستانم. هەموو شتێک درۆیەکی گەورەبووە. هەندێک شت زۆر درەنگ تێگەیشتووم. دەتتوانی بڕۆیت. لە جیاتی ئەوەی پلان دابنێیت و خۆت وا دەربخەیت کە منت خۆشدەوێت و درۆ بکەیت، دەتتوانی بڕۆیت. گەر وات بکردایە یەک تەمەن ڕێزت لەلام دەمایەوە. بەڵام تۆ نەتویست بە شەرەف و بە ڕێزەوە لە یادگەم بمێنیتەوە و درۆ و یاریکردنت هەڵبژارد.

بە درۆ ڕەشەکانت ژیانێکی ڕەنگاوڕەنگت تاریک کرد. شایەنی ئەوەبوو؟ ڕابواردن شایەنی ئەوەبوو دڵێک بکوژیت؟ دڵم زیاد لە پێویست لێت شکاوە. هیچ چاوەڕوانییەکم لە ژیان نەماوە. دڵم شکاوە، ڕووخاوە، بوەتە وێرانە. هەموو ئەمانە لەبەر تۆیە. هەرگیز نەکەیت ڕۆژێک بگەڕێیتەوە و داوای لێبوردن بکەیت. داوای لێبوردنی تۆ وەک ئەوەیە بە باران بڵێیت مەبارێ و بە خۆر بڵێیت هەڵمەیە. وە هەرگیز نەکەیت بەڵێنی باشبوون بدەیت. چونکە داوای بەخشینی تۆ وەک ئەوەیە داوای کوژانەوەی جەهەننەم بکەیت. دەبێت لەبیرت بکەم. لەبیریشت نەکەم دەبێت وەها مامەڵە بکەم کە لەبیرم کردوویت. هەرچەند لە گۆشەیەکی دڵمدا بیرت بکەم دەبێت نەفرەت و ڕقم زاڵ بکەم بەسەریدا. تۆ دەستت بەم درۆیە کرد و گوتت؛ خۆشتدەوێم. منیش بەردەوامی بە درۆکە دەدەم و دەڵێم خۆشم ناوێیت.

## ئەوانەی کە تۆیان خەمبارکرد نامرن هەتا خەمبار نەبنەوە...

خەم مەخۆ! ئەوانەی کە تۆیان خەمبار کرد هەتا خەمبار نەبنەوە نامرن. ئێستا هەتا دەتوانن با دڵخۆشبن، ببنە خاوەنی ئەو شتانەی کە دەیانەوێت، با هەموو ئەوانە بکەن کە دەیانەوێت، چۆن دەژین با بژین، ڕۆژێک بێگومان باجی دەدەن. وامەزانە دەتوانن بە دڵخۆشی بژین دوای ئەوەی ئومێد بە کەسێک دەدەن و ئازاری دەدەن. گەر ئەوان ویژدان و سۆزیان نەبێت خودا دادی هەیە. وە ڕۆژێک بەبێ گومان ڕووبەڕووی دادگای خودا دەبنەوە.

ئارام بگرە! نەکەیت گلەیی بکەیت. خودا بەندە خۆشەویستەکانی بە خەم و ئازار و نەبوونی تاقیدەکاتەوە. بەڵام هەمووی تێدەپەڕێت. ئەوەی ئارام دەگرێت پاداشتی زیادە وەردەگرێت، ئەوەی ئارام نەگرێت زیان بە خۆی دەگەیەنێت. کێ هەرچۆن مامەڵەت لەگەڵ دەکات بابیکات. تۆ هەرگیز واز لە باشبوون نەهێنیت. گەر بشتخەنە گریان و بتخەڵەتێنن واز لە نیازپاکیت نەهێنیت. بە شەیتان مەخەڵەتێ و دوای خراپە بکەویت تەنها

لەبەر ئەوەی ئەوان خراپبوون لەگەڵت. لە یادی مەکە؛ چاکە هێندە شتێکی جوانە هەرگیز پاداشتەکەی لەم دونیا وەرناگیرێت. لەبەر ئەم هۆکارە خودا بەهەشت دەکاتە پاداشت بۆ بەندە باشەکانی.

**”خەم مەخۆ! ڕۆژێک دێت خودا هەموو ئەو کەسانە موحتاجی تۆ دەکات کە خراپەیان لەگەڵ کردویت“**

## ئاهەنگی سەرکەوتن بگێڕە!

کە منداڵبووم دایکم دەیگوت؛ خواردنەکەت بەجێ مەهێڵە لە دوات دەگری. گەورە بووم، تۆم ناسی، عاشقتبووم، کە بەجێتهێشتم تێگەیشتم لە قسەکەی دایکم، بەڕاستی تۆم خۆشویست. بەڵام وەڵامی ئەو پرسیارە نازانم کە بۆچی تۆم خۆشویست. لەوانەیە دڵپاک بووبم، لەوانەیە بۆشاییم هەبووبێت، یانیش برسی دڵخۆشی بووبم. بەڵام شتێک زۆر باش دەزانم ئەویش ئەوەیە کە تۆ ئەم خۆشەویستییەت بەکارهێنام و منت خەڵەتاند. لەوانەیە منیش بەوەی کە زۆرم خۆشویستیت هەڵەم بەرامبەر کردبیت. بەڵام قبوڵی کە تۆ زۆر کەسێکی لە من خراپتریت.

کاتێک ڕۆیشتیت یەک شتی ڕاستت گوت، گوتت؛ ئاگات لە خۆت بێت. چونکە زۆر باش دەتزانی تۆ شایەنی خەم لێخواردن نیت. هەر بەڕاستی مرۆڤ ڕۆژێک تێدەگات کە کەس شایەنی خەم لێخواردن نییە. بیر دەکەمەوە تێدەگەم چەند خۆم خەمبار کردووە تەنها لەبەر ئەوەی تۆ دڵخۆشبیت. چەند گەمژەبووم! کە تۆ خەمبار دەبوویت من زیاتر خۆشم دەویستیت. کە من خۆشمویستوویت تۆ زیاتر منت خەمبار کردووە. کە خیانەتت

کردووە من زیاتر تۆم بەخشیوە. کە تۆم بەخشیوە زیاتر منت کوشتووە. بەردەوام بوویت. هەر درۆت کردووە و منیش باوەڕم کردووە. من باوەڕم کردووە و تۆش زیاتر بەکارت هێناوم. زۆر نەزانبووم و هیچ ڕاستییەکم نەبینیوە. بەڵام تۆ وادەزانیت هەموو کەس وەک من خۆشی دەوێیت. هەموو کەس وەک من هەوڵت بۆ دەدات. یانیش هەموو کەس وەک من خەم دەخوات. وە پێتوایە دەتوانیت بەم جۆرە هەموو کەس بەکار بهێنیت و ئاسودەش بژیت؟ وایە؟

من نازانم تۆڵە چییە! ئەسڵەن لە خۆمی ناوەشێنمەوە. بەهۆی کەسێکی خراپ منیش خۆم خراپ ناکەم. بۆیە بە خودات دەسپێرم. بەهۆی تۆوە زۆر فرمێسکم ڕشتووە. وە ئەم فرمێسکانە لە هەردوو دونیا ڕێگا نادەن تۆ ئاسوودەبیت. تۆ ئێستا ئاهەنگی سەرکەوتن بگێڕە، لە خۆتبایی ببە، بەڵام لە یادی مەکە خودا گەورەیە. دەتوانیت ئێستا سەرکەوتووبیت، بەڵام بە سەرکەوتویی نامریت، بزانە ژیان وەک زنجیرە، بێگومان ڕۆژێک دێت لەو شوێنەی کە لێی نوستوویت هەڵناسیتەوە و لە یاد دەکرێیت.

**"ئێستا چۆن تۆ بناسێنم؟ دەبێت بڵێم دزی ڕابردوو و بکوژی داهاتوو؟"**

## خەیاڵەکانت ئامانەتی خودایە...

واز لە باوەڕەکەت مەهێنە، چاکدەبیتەوە. چۆن دڵت ئاگری گرتبێت بەو جۆرەش خامۆش دەبێت. چۆن کەوتبیت هەر بەو جۆرە هەڵدەستیتەوە. چۆن کەسێکت خۆشویستبێت بەو جۆرە خۆشدەویسترێیتەوە. لە خۆڕا ڕەشبین مەبە. ڕۆژانی زۆر خۆشت لەپێش ماوە.

**بێئومێد مەبە! پێتوایە ئەو خودایەی دوای مردنت زیندووت دەکاتەوە ڕێگا دەدات لەم دونیایە لەناو بچیت؟**



”دەبوو ناوچەوانم مۆری هەبوونتی پێوەبووایە،
نەک پشتم برینی نەبوونیت“

”چەندین بەڵێنم دا بە خۆم، بەڵام هیچیانم نەبردە سەر. پێکەنین و خەیاڵکردنم بیرچووەوە، تەنانەت خۆشمم لە یادکرد. بەڵام هەرگیز نەمتوانی تۆ لەبیرکەم“

”مرۆڤ لە هەموو کەس خۆشدەبێت،
بەڵام تەنها لە خۆی خۆشنابێت“

”گەر تۆ بەردەوام بیت لەوەی وەک کەسێکی باش بژیت، ونیش ببیت دڵخۆشی هەر دەتدۆزێتەوە. چونکە خودا بێگومان بەندە باش و پاکەکانی خەڵات دەکات“